# ئەو هەڵانەی دەرهەق
# بە قورئانی پیرۆز دەکرێ

شەرحکردنی

رحمه الله
مامۆستا کامەران کەریم

نووسینەوە و ئامادەکردنی

زانستخوازێکی شەرعی

## پێشەکی :

بسم الله، والحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن اهتدى بهداه،،،
باسی ئەو هەلە و موخالافاتەی کە دەرحەق بە قورئانی پیرۆزدا دەکرێی دەکەین چونکە ئێوەی بەرێز دەزانن الله تعالی لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێی : (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَىٰ وَالْفُرْقَانِ ۚ)[1] ئەگەر ئەم ئایەتە جوانە بەیەکەوە سەیر بکەین الله تعالی دەفەرمووێی : مانگی رەمەزانە کەوا قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە هەموو جارێك مامۆستایان بۆتان باس دەکەن کە ئەم مانگی رەمەزان مانگی رۆژوو و مانگی قورئانە ، بۆیە باسی قورئانی پیرۆز دەکەین وە باسی ئەو موخالەفاتانە بکەین کە ئینسانی موسلمان لەبەرامبەر ئەو کیتابە پیرۆزەی الله تبارك وتعالى دا تێدەکەوێی .

ئەوەتا لەم ئایەتەدا دەفەرمووێی : لەمانگی رەمەزاندا قورئانمان ناردوە ، پێمان ئەلێ قورئان بۆچی هاتووە ، ئەفەرمووێی : (هُدًى لِّلنَّاسِ) هدى لەزمانی عەرەبی رێنمای کردنە بۆ رێگەی راست رێبازی راست و دروستی الله تعالی یە بۆ ئێوە نەکەن بچن رێبازی تر هەلبژێرن ئەم قورئانەیە رێبازەکەی ئێوە لێتان تێك نەچێ و سەرتان لێی تێك نەدەن شەیطانەکان بەبارێکتردا نەتان بەن بەرێبازیکیتردا نەتان بەن وریای خۆتان بن بەم قورئانە نەبێ ناگەنەوە بە الله تعالی ، تێکەلاو بەدونیا نەبن دونیاویەکان سەرتان لێی بشێوێنن ئەوانەی کەوا دەلێن : (رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا)[2] بەس بەتەنها ئەوەندە و ئەوەستن بەس داوای دونیا دەکەن ، الله تعالی دەفەرمووێی : ئەوانەی ئەوها بلێن لەئاخیرەتدا هیچیان نادەینێی .

دیارە کێ رێگەی دونیای گرتوە و دیاریشە کی رێگەی الله تعالی گرتوە ئەوەی رێگەی الله تعالی بگرێی ئەوەندەی لێ دەترسێ بەمووێك موخالەفەی الله تعالی ناکا ئەگەر موخالەفەیەکیشی کرد زۆر داوای لێبوردن لە الله تعالی دەکا و ئەگرێی و دەپارێتەوە فرمێسك ئەبارێنی ، بەلاّم ئەوانەی رێبازی شەیطانیان گرتووە لەئینسانەکان و لەجنۆکەکان موخالەفە لەسەر موخالەفە ئەیکەن لادان لەسەر لادان ئەیکەن خۆیان و خەلکیش وێل دەکەن ، ئینجا

---
[1] :سورة البقرة اية : ١٨٥
[2] :سورة البقرة اية : ٢٠٠

دلیشیان وەك بەرد رەقە و ناجولێ  فرمێسکێك نابارێنن بەسەر گوناھ و تاوانیاندا چونکە شەیطان وای لێکردوون وا ئەزانن لەسەر رێگەی راستن ، وای لێکردون کە کەس بەحەق نازانن لەخۆیان زیاترنەبێ  بۆیە ئاگاداری ئەوانە بن و وێلتان نەکەن بەپارە و بەدینار و درھەم یاخود بەمەکاسبی دونیاوی ھەلتان نەخەلەتێنن  چونکە دونیا بەجێی دەھێلی برا و خوشکی بەرێزم .

ئێوە وەرەن ھەریەك لەئێوە بەتاقی تەنیا لەگەل الله دا با بیربکاتەوە کێ بەفریای دەکەوێی ؟! بابیر کەینەوە کێ بەفریای دەکەوێی لەرۆژی قیامەتدا چ رێگا و رێبازێك فریای ئەم کەسە دەکەوێی کە چوویەوە بۆ لای الله تعالی ، بۆیە الله تعالی دەفەرموویێ : (هُدًى لِّلنَّاسِ) لەئاسمانەوە پێمان ئەلێ  ١٤٠٠ سالە ئەم قورئانەی ناردۆتە خوارەوە پێمان ئەلێ ئەم قورئانە رێگەی ئێوەیە ئەم قورئانە رێبازی ئێوەیە برۆن بیخوێنەوە ، قەناعەتان ھەبێ چەندەھا کەس ھەیە کە مردوە لەوانەیە رۆژێك لەرۆژان لەم سەر تا ئەوسەری قورئان بەچاوی نەبینی بێ نەزانی ئەم قورئانە چ باسە تێدا نەیزانیوە ئەم قورئانە باسی چ دەکا نەی زانیوە رێبازی راست و دروستی ئەوە بۆلای الله تعالی ، رۆیشتووە بەبێ ئاگایی ، بۆیە الله تعالی دەفەرموویێ : (هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَىٰ وَالْفُرْقَانِ ۚ)[٣] بينات : جەمعی بینەیە الله تعالی لەم قورئانەدا ھەموو بەلگە روون و ئاشکراکانی داناوە بۆ ئەو رێگە راستە بۆ جیاکردنەوەی نێوانی حەق و باطل ئەم قورئانە حەق و باطل لێك جیا دەکاتەوە  لەصەحیحی بوخاری داھاتووە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە الله تعالی ناردوویەتی : مەلائیکە وتی : (وَمُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرْقٌ بَيْنَ النَّاسِ " .)[٤] واتا محمد (صلی الله علیه وسلم) خەلکی کرد بە دوو بەرەوە ، بەرەی حەق بەرەی باطل بەرەی بڕواداران بەرەی بێ بڕوایان بەرەی ئەو کەسانەی رێگەی الله تعالی دەگرن و بەرەو لای الله تعالی دەرۆن بەرەی ئەو کەسانەی بۆلای شەیطان و ناخی جەھەنەم دەرۆن ، وریا بن خۆشەویستانم ئەمرۆ ئێمە ئەوە ئەلێن و سبەی ئەمرین ھەمووشمان ئەچینەوە بۆلای الله تعالی بۆیە ئاگات لەخۆت بێ رێگەکە وێل مەکە ، ئەوەتا لەنوێژەکەتدا خۆت ھاوار دەکەی ئەلێ : (اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ)[٥] داوا لە الله دەکەی نوێژەکە با ھەر

[٣] :سورة البقرة اية : ١٨٥
[٤] :صحيح البخاري  رقم الحديث: ٧٢٨١
[٥] :سورة الفاتحة اية : ٦

حەرەكات نەبیٚ با هەر جولە نەبیٚ با هەر وەرزش نەبیٚ بامانای تیّدا بیّ و ناوەرۆكی تیّدا بیّ نویّژ لەسەر دوو بەشە بەشیّك لەروانگەی دەرەوە ظاهیرەكەی ئەبیٚ چۆن دەست بگریی و چۆن دەست  و نویّژ بگری چۆن چی و چی بكەی بەم شیّوازە نابی بجولی و نابی بخۆی و بخۆیتەوە و نابی قسە لەگەل خەلكی بكەی ئەمە لەروانگەكەی دەرەوەیەتی  لە روانەگەكەی ناویشەوەی هەموو ناو دلتەوە تۆ ئەبیٚ لەگەل الله تعالی دا بی كەلیمە لەگەل كەلیمە ئەبیٚ تۆ لەگەل الله تعالی دا برۆی قسە لەگەل الله دا بكەی تۆ یەكیّك لەقسەكانت ئەوەیە كە دەلیٚ : خوایە تۆ ریّگەی ئەو پیّغەمبەرانم نیشاندە كەتۆ ناردت ، ریّگەی جولەكە و ریّگەی گاورم نیشان مەدە ئەی خوای گەورە داوا لە خوای گەورە ئەكەی .

## کار نەکردن و هەجرکردن

جا با لەخزمەتاندا بێنە سەر دوو ئایەت لەسورەتی الفرقان الله تعالى دەفەرمووێ : (وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَٰذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا (٣٠) وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ الْمُجْرِمِينَ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا (٣١))[٦] پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گلەی و گازندە دەکا لەقەومەکەی کە بەوقورئانە نازدارەوە بۆیان هاتوو ئەوان پشتیان تێکرد ئەوان روویان تێنەکرد بەپێچەوانەوە دەر بەدەر و شار بەدەریان کرد و قسەیان پێی وت و پێیان وت شێت ، تخوا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شێتە یان ئەبو جەهل شێتە !؟ بەئێوە دەلێن پێغەمبەر شێتە (صلى الله عليه وسلم) یان قوریشی کافری موشریك شێتە ؟ ئەمرۆش ئەوەی کە لەسەر قورئان ئەروا شێت و بێ عەقلە یان ئەو کەسەی پشتی کردۆتە قورئان کامیان شێتە !؟ ئا پێم بلێن شێت کامەیە .

الله تعالى دەفەرمووێ : (كَذَٰلِكَ مَا أَتَى الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم) لەپێشیشدا کەسانێك هەر ئاوا نەدەهاتن (مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ)[٧] سەیرکەن خۆشەویستانم پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام )کە دەهاتن موعجیزەیان پێی بوو کەس نەیدەتوانی وەك ئەوان بکا بەپێغەمبەریان وت (صلى الله عليه وسلم) دەی ئەگەر تۆ پێغەمبەری ئەو مانگەمان بۆ شەق کە مانگی بەئیزنی الله تعالى شەق کرد ، تخوا هیچ ساحیرێك ئەتوانی مانگ شەق کا ؟! ئێوە وەرن ساحیرەکانی دونیا هەر هەمووی کۆ بکەنەوە لە سەرەتای دونیا تا ئاخیری دونیا بزانم کەسیان ئەتوانی مانگ شەق بکا کەشەقی کرد وتیان تۆ ساحیری !

هەی شێتینە ئێوە شێتن ، پێیان ئەلێ : (إِلَّا قَالُوا سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ) والله پێغەمبەر شێتە ! والله ئێوە شێتن پێغەمبەر شێت نیە (صلى الله عليه وسلم) ئەمرۆش بە ئێمە دەلێن شێت دە تۆ سەیری ئەو شێت و وێتانە بکە عەقلیان بەچی خەریك کردوە قورئانێك و قەبرێك ئاخیرەتێك و ئەم قسە قۆرانە چیە ئەم قسە هیچ و پوچانە چیە بخوا ئەم جەماعەتە شێت و وێتن !

---

[٦] :سورة الفرقان
[٧] : سورة الذاريات اية : ٥٢

ئێمە شێتین یان ئێوە شێتن ؟! ئێمەیەك كە روو دەكەین خوای تعالی ئەڵێن : مادەم بڕوامان بە خوای تعالی هەیە مادەم ئیمانمان پێی هەیە مادەم قورئان و پێغەمبەری ناردوە (صلی الله علیه وسلم) نابێ لەخۆمانەوە ئیش بكەین ئەوە هیدایەتەكەیە و ئەوە رێبازەكەیە و رێگەكەیە ئەوە حیزبەكەی خوای تبارك وتعالی یە وە هەر ئەویش سەردەكەوێی ، بەڵام ئێوەی شێت هەزار و یەك رێگەتان گرتووە ئێمە یەك رێگەمان هەیە هەزار و یەك قسە دەكەن هەزار و یەك ئیختلاف لەنێوانتان هەیە بزانم قەت ئەوانەی كە رێگەی غەیری خوا دەگرن رێك دەكەون موستەحیلە ئیتفاق بكەن هەتاوەكو كافر لەنێوانی خۆیدا ، الله تعالی دەفەرمووێی : (تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ)[8] كافر وایە وادەزانی هەموو یەك دەستە بەس لەنێوانی خۆیان چەند بەشە هەزار و یەك پارچەیە.

هەتا ئێوە سەیر كەن بزانن كاتێك كە كۆمەلێك كۆ دەبنەوە پێ دەلێن نوێنەرانی گەلْ مەجلیسی شەعب پەرلەمان هەتا دوای ،، هەر كەلیمەی پەرلەمان خۆی لەخۆیدا سەیری بكەی واتا مناقشە واتا موجادەلە یانی نابێ رێك بكەوین ئەبێ هەریەكەو شتێك بلێن ئیتفاق نیە ، لەبەر ئەوە الله تعالی دەفەرمووێی : (وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا)[9] ئەگەر لە غەیری الله تعالی وە شتێك بێ والله هەزار ئیختلاف تێدایە ، بەس كە قورئان هات ئومەت هەمووی ئەكات بەیەك ، كە فەرموودەی الله تعالی هات هەمووی ئەبێ بەیەك ئەوەی نابی تەواو ! ئەوە رێگەی وێلی گرتوە بەس ئەگەر بێتوو هەر هەموو موسلمان دەست بەم قورئانە بگرێی وەكو خۆی پارچە پارچە نابێ هەتا بۆیە لەقورئاندا پێمان دەفەرمووێی : (كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ۚ)[10] ئەمە زۆر گەورەیە لەسەر موشریكەكان كە تۆ بانگیان لێ دەكەی دەلێ وەرنە سەر ئەو قورئانە ، ئەوان دەلێن چۆن دەبێ ئێمەیەك پارچە بین نابێ یەك پارچە بین دەبێ هەریەك قولێك و بۆچونێكمان هەبێ دەبێ را و رای جیاواز هەبێ ، تخوا بەس پێتان بلێم ولاتێك دوو سەر و سەركردەی تێدا بێ ئیسراحەت دەكا ؟! الله تعالی دەفەرمووێی : ئەرز و ئاسمان ئەگەر دوو خوای تێدا بێ ئیسراحەت ناكا ، (لَوْ كَانَ

[8] : سورة الحشر اية :١٤
[9] :شورة النساء اية : ٨٢
[10] :سورة الشوري اية : ١٣

فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾[11] ئەفەرموویێ : ئەم کەون و کائیناتە ئەگەر دوو خوای تێدابایە هەمووی تێك دەچوو . سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەیەکە سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە دوو نیە و کەسی و چوار نیە الحمدلله یەك خوامان هەیە کە الله یە .

جا ئێمە با بچینە سەر ڕێگەکەی وەبا بزانین موخالەفاتی ئێمە لەم قورئانە چیە .

## یەکەم موخالەفە : (بروا نەهێنان پێی )

بڕوا نەهێنانە پێی یان ئەگەر بڕوات پێی هێنا نیخوێنیتەوە یان ئەگەر خوێنتەوە کاری پێی ناکەی یان ئەگەر ئیشت پێ کرد لەبەر الله تعالی ناکەی ، ئەمە هەمووی مخالەفاتن زۆر ورد ببنەوە لێی .

ئادەی بزانم ویردی ڕۆژانەمان هەیە عبدالله عمری کوری عاص (ڕەزا و ڕەحمەتی الله تعالی لێ بێ)باوکی ژنی بۆ هێنا گەنج بوو خەریکی عیبادەت بوو عیبادەتێکی زۆر ئەکرد بەڕۆژ هەمووی بەڕۆژوو بوو وە بەشەویش شەو نوێژی ئەکرد ئەوە بیریشی لە ئافرەت نەئەکردەوە باوکی ژنی بۆ هێنا کە ژنی بۆ هێنا پاش ماوەك لەبووکەکەی پرسی باوکی ، عەمر لێی پرسی عبدالله کورەکەم چۆنە لەگەڵت دا ؟ وتی : والله لەو ڕۆژەی منی هێناوە نەهاتۆتە سەر جێ لەگەڵ من حەزی بەوشتانە نیە ، باوکی چوو شکاتی کرد لەلای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوەتا ژنم بۆ عبدالله هێناوە ئەوە حالەکەیەتی ! پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : وەرن بزانم چیە ! وتی : بەڕۆژوو وە نایشکێنی وە شەو نوێژدەکا و ناخەوێ ئەوەش خێزانم بۆی هێناوە و ناچێتە لای ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویی : عبدالله وانابێ ، شتێکیتریشی کرد جا ئەوە گرینگە وتی هەموو ڕۆژێکیش قورئانەکە تا کوێی هاتۆتە خوارەوە هەمووی دەخوێنێتەوە ! پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویێ : وەرە تۆ لەمانگێك دا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە

[11] سورة الأنبياء اية :٢٢

فەرموویی من لەوە باشتر ئەتوانم ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەرە ئەوەندە ئەوەندە هەتاوەکو هاتنە سەر ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : تۆ نابێ هەموو ڕۆژەکە بەڕۆژوو بی بەلکو ڕۆژەك نا ڕۆژەك بەڕۆژو بە .

ئی ژنیش لە سونەتی منە ژنت هێناوە ئەچیتەلای خێزانت ئەوە شەرعی الله تعالی یە ئەوەی حەزی لەو سونەتەی من نەبێ لەمن نیە .

شەو نوێژیش ئەوە من دەخەوم شەو نوێژیش ئەکەم تۆش وا بکە .

سەیری ئەم صەحابە بەڕێزە بکەن کاتی خۆی صەحابە چیان دەکرد ؟! پێش برکێیان لەخێردا بەم شێوەیە دەکرد لەوکاتە چی بهاتیا خوارەوە قورئانی تا ئەوی هەمووی دەخوێندەوە .

پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم) فەرموویی : ئینجا قورئانەکە وامەکە لەمانگێکدا قورئان بخوێنەوە واتا خەتمێك بکە ، فەرمووی لەوە باشتر ئەتوانم ،دەی لەبیست و ئەوەندە و ئەوەندە تا سێ ڕۆژ ، فەرمووی : دەی لەسێ ڕۆژ تۆ نابێ خەتمێك بکەی[١٢] ،یەك ڕۆژ دوو ڕۆژ سێ ڕۆژ کەمتر نەبێ واتا هەموو ڕۆژەك ئەگەر ئێمە سەیر بکەین لەوەی کەوا هەیە تۆ قورئان بکەی بە سێ بەشەوە ڕۆژی بەشێکی تا بخوێنی بۆ ئەوەی تۆ لەسێ ڕۆژدا تا قورئانەکە بخوێنی فەرمووی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تۆ لەسێ ڕۆژدا قورئانەکە خەتم بکە لەیەك ڕۆژدا مەیکە ئەوەی لەیەك ڕۆژدا قورئان هەمووی بخوێنێتەوە تێ ناگا ، سەیری ئەم صەحابانە بکە چیان ئەکرد لەکاتی خۆیدا .

بەم شێوەیە بوون لەگەل قورئانی پیرۆزدا بەلاَم قومەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە موشرکین بوون بزانە قورئان دەفەرمووێ چی:( وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا

[١٢] " ئەم حالەتە بۆ دووحالەت جائیزە و ڕێگە پێدراوە ئەوانیش زمانی و مکانی ، نمونە لەمانگی ڕەمەزاندا یاخود لەسەفەری عەمرەدا . بۆزانیاری زیاتر بگەڕێوە سەر تەفسیری الزمر لەویدا مامۆستا کامەران بە دوور و درێژی باسی دەکا ، والله أعلم.

هَٰذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا (٣٠) وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ الْمُجْرِمِينَ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا (٣١))[١٣]

(وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ) پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ : ئەی پەروەردگاری من (إِنَّ قَوْمِي)ئا ئەو قەومەی قوریشی من (اتَّخَذُوا هَٰذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا) ئەم قورئانەیان پشت تێ کرد ئیمانیان پێی نەهێنا وازیان لێی هێنا ، (وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ الْمُجْرِمِينَ ۗ) الله تعالى دەفەرمووێ : هەر بەهەمان شێوە ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم ) دڵت بێ تاقەت نەبێ قەومەکانی پێشوش وابوون کە پێغەمبەرەکان کیتابیان بۆ دەهات ئەوها دووژمنیان هەبوو (وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا) (ِكُلّ) واتا هەموو پێغەمبەرێك لەپێغەمبەرەکان (عليهم الصلاة والسلام) دووژمنی بۆ داناوە (عَدُوًّا مِّنَ الْمُجْرِمِينَ ۗ)لەتاوانباران و لەستەم کاران دووژمنایەتی ئەو پێغەمبەرانەیان کردوە (عليهم الصلاة والسلام) بەڵام ئاگاداربە ئەو کە دووژمنتە یانی ئەوە بۆ ئێمەشە ، ئێمەش دەست بەقورئان بگرین و بلێن خەلکینە وەرنە سەر قورئان دوژمنمان بۆ زیاد ئەبێ خۆشەویستانم والله لەگەل وتت (لا اله الا الله محمد رسول الله صلى الله عليه وسلم) و تێی گەیشتی و لەسەر ئەم بەرنامەیە رۆیشتووی جن و ئینس ئەبێ بە دووژمنت زۆرینەی زۆریان واتا تۆ هەستای دووژمنێکی زۆرت بۆخۆت دروست کرد خەیالت خاو نەبێ بلێ من والله عیلاقەی دووژمنایەتی کەسم نیە تۆ لەدین تێگەیشتووی بۆیە دەلێ عیلاقەی دووژمنایەتی کەسم نیە ، چونکە کەتۆ وتت قورئان بەرنامەی منە یانی هەموو بەرنامەیەکتر رەفز دەکەم ئەو بەرنامانەی تر هەمووی دەبنە دووژمنی تۆ ! !

بەس تۆ نایەت بەمەنهەجی قورئان وەری بگریی بەلا بەلا وەرت گرتوە بۆیە تۆ بچی قورئان بخوێنی و لەبەری بکەی بچی لەمزگەوتەکان بخوێنی و بەس کاری پێی مەکە کەس قسەناکا هیچ کافرێك قسە ناکا و عیلاقەی بەسەرتەوە نیە و دووژمنایەتیت ناکا ، بەس کە تۆ کردت بە عەمەل و کردت بەئیش و جێ بەجێت کرد و ئەحکامەکانیت جێ بەجێ کرد دەولەتت لەسەر ئەساسی ئەم قورئانە جێ بەجێ کرد هەموو دونیا لێت ئەبێ بەدووژمنت ، وایە یان وا نیە ! ؟

---

[١٣] :سورة الفرقان

دەی ئێستا با پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زیندوو بێ ! بلێ من دەمەوێی دەولەتێکی ئیسلام تشکیل بکەم بە شەرق و غەرب رازی نابم چی لێ دەکەن ؟! یەکسەر ناوی لێ دەنێن تیرۆرست محمدی تیرۆرست ، ئەمریکا ؟ بەلێ . تەیارەکانت بنێرە ، ئەوروپا ؟ بەلی، باشترین ئەسلیحەت بنێرە با زوو لەناوی بەرین ، ئەی قەومە موسلمانەکە ؟ ئێوەش کلکی ئێمەن دەی لێی دەن کاکە ! هەتا یەکێك دەلێ پێغەمبەری خوا بەقوربانی بم (صلى الله عليه وسلم) هەزار کەس دەلێ ئەوە تیرۆرستە ئەو محمدە ! ئێستا لەژیاندا بێ وایە والله ! وایە بەخوا چونکە محمد (صلى الله عليه وسلم) بەکەس رازی نابێ به الله نەبێ بەکەس رازی نابێ ، ئایا ئەو خەلکە لێی رازی دەبێ !؟ دەرەوە با ئێستا پێغەمبەر لەژیاندا بێ بلێ من دەولەتێکی ئیسلامم دەوێی کەس لێی رازی دەبێ ؟ نەبخوا کەمێکی نەبێ .

تەبعەن ئایەتەکە لەدواتر دا دەلێ : محمد کە ئەوانە دووژمنی تۆیە ئەوانەی پێشوش هەمووی دووژمنی هەبوە ئاگاداربە بۆ پێغەمبەرانیتر تۆش دەبێ دووژمنت هەبوە ئەمە سیراعە ئەم سەر زەوی ئەمە جێگەی ئیسراحەت نیە ئەمە جێگەی ململانیە حەق وباطل زۆران دەگرن یەکێکیان یەکێك دەبات بەعەرزدا تۆ نابێ لەدووردا سەیر بکەی بلێ بزانم پێغەمبەر ئازایە یان ئەبو جەهل (صلى الله عليه وسلم) ئەبێ بچی یارمەتی پێغەمبەر بدەی (صلى الله عليه وسلم) یارمەتی نەدەی ئیمانت نیە ئەبێ یارمەتی ئەو کەسانە بدەی کە شوێن پێغەمبەر کەوتون (صلى الله عليه وسلم) چونکە ئەگەر بەو یارمەتیە نەبێ ناڕوا ئەو دینە ناگەیەنرێی ، هەتا ئێوارە من هاوار بکەم ئەگەر بەتاقی تەنها خۆم بم هیچم پێی ناکرێی.

الله تعالى لەدواتر دا فەرمووێی : (وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا)بەلأم وریاش بە سەرکەوتن هەر بۆتۆیە بەسە بە پەروەردگاری تۆ کەوا رێنمای دەر بێ و کەسیتر رێنمای دەر نیە ئەمە یەك دووەمیش (وَنَصِيرً) ئەگەر الله تعالى رێگە دابنێ ئەو رێگەیەش هیچ کەسێك لێی رازی نەبێ إلا بڕواداران نەبێ با بڕوادار لەخۆی نەترسێ با جورئەتی هەبێ بلێ من خوام لەپشت بێ کێ ئەتوانی من بدا بەئەرزدا بەس ئێمە ئەو ئیمانەمان نیە خۆشەویستانم ، والله ئەوەندەی لەدووژمنانی خوا ئەترسین ئەوەندە لە الله ناترسین ، ئا ئێستا کێ ئەتوانی بلێ بەرە و دینی خوا ئەرۆم و من مل نادەم بەهیچ کەسێك و داوا ئەکەم لە الله تعالى سەرمان خا بەسەر شەرق

و غەربدا ، یان دەلێن نەوالله کورەکاکە بۆخاتری خوا مەکەن کورە پارچە پارچەمان دەکەن کورە ئیبادەمان دەکەن !! کورە بچۆ بۆ مالەکەی خۆت دانیشە کەچی الله تعالی دەفەرموویێ : (وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا) الله بەس نیە سەرت خا ؟! الله بەس نیە رێنمایت کا بەسە یان بەس نیە ؟! پێویستی بەکەسیتر هەیە الله تعالی ؟! نەخێر ، ئەی تۆ پێویستت بەکەسیتر هەیە لە خوا زیاتر ئەوەیە ئیمان ئینجا دووشت هەیە لەبەردەمت دا یان سەردەکەویی یان دەکوژریی ،

هەردووکیشی سەرکەوتن و نەصرە بۆتۆ (إما النصر وإما الشهادة.) لەپێناوی الله تعالی دا شەهید دەبیٚ الحمدلله خوایە من لەپێناوی تۆدا وام کرد بەلاٚم منیان کوشت ،

الله دەفەرموویێ : دەی برۆ بۆ بەهەشت وەکو لەسورەتی یاسین دا هاتووە : بەداخەوە زۆر بەداخەوە سورەتی یاسین لەوانەیە زۆر بەی پیرەمێردەکانیش لەبەریان بیٚ بۆچی لەبەریانە بۆ ئەوە نیە هیدایەتی پێی وەرگرن بۆ فکریەیەکی غەلەت ئەلیٚ بەسەر مردوودا بیخوینەوە وا دەبیٚ و وا دەبیٚ ، برۆ سەیری سورەتی یاسین بکە بزانە چی تێدایە چەندەها پەند و ئامۆژگاری تێدایە ئەم سورەتە بەرێزە سەرەتاکەی بەوە دەست پیٚ دەکا

(يس (١) وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ (٢) إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ (٣))[١٤] الله تعالی دەفەرموویێ : سوێند بەو قورئانە تۆ پێغەمبەری منی دواتر باسی چەندەها باسی بەسود دەکا یەکیٚ لەوباسانە باسی کەسێکمان بۆ دەکا کە دیفاعی لەچەند پێغەمبەرانێك (عليهم الصلاة والسلام) کردوە کەوا مشهور بوە لەکیتابە تەفسیرییەکان ئەلێن ناوی (حبيب نجار) بەلاٚم لەقورئاندا باسی پیاوێك دەکا ، کە لەوسەری ولاتەوە هات بۆ ئەوەی پێغەمبەرەکان سەرخا بەتاقی تەنها بەتەنها بوو کەسی لەگەلدا نەبوو دواتر کوشتیان ، چەند هاواری لەخەلکەکە کرد کورە ئەمە پێغەمبەری خوان ئەوانە رێنمایتان دەکەن چۆن ئەبیٚ ئێمە غەیری الله بپەرستین چۆن ئەبیٚ رێگەی غەیری الله وەربگرین ، وتیان : ئەوە چی دەلیٚ تۆی وەکو ئەوانەی ئەمرۆ پێیان وت هەی موجریم ئەی تیرۆرست و ئیرهابی و هەی فلانی ،،!! لێیان دا و کوشتیان الله تعالی

---

[١٤] :سورة يس

فەرموویی : (قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ ۖ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ)[15] الله تعالى فەرمووی : برۆ بۆ بەهەشت کاری تۆ تەواو بوو لەتاقیکردنەوەکەت دەرچووی برۆ بۆ بەهەشت ، کەچی لەوێدا ئەلێ : خۆزگە قەومەکەم بیانزانیایە کە الله تعالى چەند رێزی لەمن نایە من ئەو بێ رێزە نەبووم کە ئەوها سەیریان کردم بە ئیجرام و موجریم و ئیراهبی و تیرۆرست و خائین چەپەل و پیس کۆنە پەرست !من ئەوە نەبووم ئەها الله تعالى رێزی لێنام (قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ (٢٦) بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ)[16] خۆزگە قەومەکەم بیانزانیایە کە الله تعالى لەمن خۆش بوو وە رێزی لەمن نا و منی خستە ناو بەهەشت .

ئەم چیرۆکەی تێدایە سورەتی یاسین ، بەس تخوا کێ لەسورەتی یاسین ئەم سورەتە وەکو خۆی وەردەگرێت و ئیشی پێ دەکا بێت دیفاع لە حەق بکا با بەتەنهاش بێ ، پێ ئەلێ کاکە لەروالەت وەکو پێغەمبەربە (صلى الله عليه وسلم)لەناخیشیت وەکو پێغەمبەربە (صلى الله عليه وسلم)، ئەلێ : کاکە لەروالەت با وەکو پێغەمبەر نەبین ئەمان کوژن ریشمان هەبێ ئەلێن موشکیلەیە ریشمان هەبێ پێمان ئەلێن تیرۆرست ، ئی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەمری فەرمووە ، ئەلێ نا بەقسەی پێغەمبەر ناکەین بەکلك نایی ئەمە رۆژی ئەوە نیە بەقسەی خوا و پێغەمبەر بکەین ! ئەی بۆ نوێژ دەکەی دەی نوێژەکەش مەکە ئەی بۆ رۆژوو ئەگریی ئەی تۆ هەر بەقورئان و بەحەدیس نوێژو رۆژوو ناگریی دەی لەشتەکانیتریشدا بەقسەی بکە .

ئیمامی إبن كثير (رحمه الله) دەفەرموێ : (يقول تعالى مخبرا عن رسوله ونبيه محمد – صلوات الله وسلامه عليه دائما إلى يوم الدين) واتا : خوای تبارك وتعالى خەبەر ئەدا بە پێغەمبەرەکەی محمد (صلى الله عليه وسلم)سەلامی هەتا رۆژی قیامەت لەسەر بێ (أنه قال : وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَٰذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا)[17] ئەی پەروەردگاری من ئەو قەومەم ئەو قورئانەی منیان واز لێ هێنا (وذلك أن المشركين كانوا لا يصغون للقرآن ولا يسمعونه)قورئانی

---
[15] :سورة يس اية : ٢٦
[16] :سورة يس اية : ٢٦-٢٧
[17] :سورة القرقان اية : ٣٠

بۆ ئەخوێندنەوە گوێیان لێ نەئەگرت ! ئەیانوت لێمان گەرێی وازمان لێبێنە هەروەکو لەئایەتێکتردا دەفەرمووێی : (وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ)[18] کافرەکان ئەیانوت گوێی بۆ ئەم قورئانە مەگرن بیکەن بەهەرا و هەلا گۆرانی و مۆسیقا و قسەی هیچ و پوچ و چیرۆك و بەرنامەی گومرا و گومراکەری تێدا بێنن با ئەو خەلکە شوێنی نەکەوێی بۆ چونکە ئێوە سەردەکەون بەوشتانە بکەن تا سەرکەون .

ئەمرۆش هەمان شتە ، ئەلێن : قورئان لێ گەرێی کاکە برۆ بەرنامەیەکیتر بێنە گۆرانی بێنە و رابواردن بێنە واز لەقورئان بێنن با ئێمە سەرکەوین بەسەر موسلمان و قورئانیەکاندا کە ئەلێم قورئانی مەبەستم ئەو کۆمەلە نالەبارە نیە کە ئێستا بەناوی قورئانی هاتوون کە ئەلێن بەس قورئان حەدیسمان ناوێی ! مەبەستمان ئەوە نیە قورئانی ئەو کەسەیە کە بەتەواوی شوێنی قورئان بکەوێی.

(وكانوا إذا تلي عليهم القرآن أكثروا اللغط والكلام في غيره ، حتى لا يسمعوه .)إبن کثیر ئەلێ : ئەگەر قورئان بخوێنرایە هاوار و قیژەیان ئەکرد گۆرانیان ئەوت بۆ ئەوەی کەس گوێی لەقورئانەکە نەبێ ، جا ئیمام ئەفەرمووێی : (فهذا من هجرانه)ئەوە یەکێکە لەو پشت تێکردنەی کە کافرەکان پشتیان ئەکردە قورئان ، لەو واز لێهێنانە لەو دوورکەوتنەوەیە لەو تۆراندنە کە لەقورئان ئەتۆران (وترك الإيمان به وتصديقه من هجرانه)ئەگەر ئیمانی پێ نەهێنی و بروای پێی نەکەی ئەوەش بەشێکترە لەوەی کە تۆ خۆت لە قورئان ئەتۆرێنی (وترك تدبره وتفهمه من هجرانه)خۆ ئەگەر ئیمانت پێی هەبێ ورد نەبیتەوە لەئایەتەکانی تێی نەگەیت و نەچیتە ناوەرۆکەکەی بزانی ناوەرۆکەکەی باسی چی دەکا ئەویش هەر پشت کردنە لەقورئان ئاگاداربن (وترك العمل به وامتثال أوامره واجتناب زواجره من هجرانه)ئیش نەکەی بە ئەمرەکانی ئەو ئەمری پێت دەلێ ئەوها بکە نەیکەی ئەوها بلێ نەیلێ ی وە واز نەهێنی لەوشتانەی دەیلێ مەکە و بیکەی و نەیلێ و بیلێت ئەوە تۆ پشتت کردۆتە قورئان باش بزانە .

---

[18] :سورة فصلت اية ٢٦

(والعدول عنه إلى غيره – من شعر أو قول أو غناء أو لهو أو كلام أو طريقة مأخوذة من غيره – من هجرانه)رەحمەتی الله لە إبن كثير ئەلێ بۆ ئەم رۆژە قسە ئەكا ئەلێ : ئەگەر تۆ واز لەقورئان بهێنی برۆی بۆلای غەیری قورئان لەشعیر یا یەك یەك قسەكانی راڤەكەین و لێكی بدەینەوە .

ئەمرۆ لەلای خەلك قورئان زیاتر خۆشەویستە یان شیعر و هەلپەركی و هەلبەست و لاواندنەوە و ئەوبابەتانە بۆخۆتان ئەزانن ؟! (أو قول) یان وتەی كەسێك ، كەسێك قسە دەكا دەلێن ئەها فلان كەس قسە دەكا گوێی بۆ بگرە فلان كەس بەس قورئان خوای تبارك وتعالی قسە ئەكا بەلایەوە گرینگ نیە بەقسەی فلانە كەس دێتە گریان بەقسەی الله تعالی نایەتە گریان ئەوە خەلەلت تێدایە تۆ (أو غناء)والله ئەلێ لەمرۆیا قسە ئەكا بەناو موسلمانەكان هاتوون گۆرانی و مۆسیقایان داناو گۆرانیان دانا و هێنایان و بردیان گەنجەكانمانیان وێل كرد لەو قورئانە پیرۆزە لەجیاتی گەنجەكان هەمووی لەتەمەنی ٦بۆ ٧ سالی هەمووی وەكو شافیعی هەمووی قورئانی لەبەر بووایە ئێستا ناو سنگی پرە لەگۆرانی پرە لەسرود پرە لەشیعر پرە لە ئەم لا و ئەولا كەچی ئەوەندەی قورئانی تێدا نیە (أو لهو)خۆ مەشغول كردن بە لەهو لەعیبەوە ، ئەو تۆپانیەی ئەمرۆ بۆ ئێمەیان داناوە مێشكی هەمووماني تێك داوە ئاگات لەقورئان نەماوە ، برۆ لەساحەیەكدا لەنێوەرۆوە هەتا مەغریب هاوار دەكەن و فیكە لێدەدەن چی والله فەریقی فلان بردیەوە ، ئەی قورت بەسەر فەریقی فلان چ سودێك بەتۆ دەگەیەنێ ، یان لەمالەكەی خۆی دانیشتوە ئەورووپیە كافرەكان و ئەمریكیە كافرەكان ئەوە یارییانە با بزانین كێ سەر دەكەون (أو لهو أو كلام)قسەی فلان و قسەی فیسار (أو طريقة مأخوذة من غيره – من هجرانه)رێباز و رێگایەك كە لەغەیری قورئان وەرگیراوە خۆی بەوە مەشغول دەكا ، ئەلێ ئەمە هەمووی خۆتۆراندن و پشتكردنە لەقورئان .

زانایان دەفەرموون : ئەگەر ئەو دلە پاك بێ ئەو دلە سەلیم بێ والله قەت لەقورئان تێر ناخوا خۆ كوردەواری خۆشمان قسەیەكی جوان دەكەن ئەلێن : باشتر وابوو بەجوانتر وترابایە ئەلێن : زۆر وتن قورئان خۆشە ، بەس قورئان خۆشە ، هەرچی قسەیەك بكەی سودی نیە وەك

ئەوەی کەتۆ قورئان بلێتەوە  چونکە هەر حەرفێك بەدە حەسەنەیە ئاگاداربە تۆ قەت زەرەر ناکەی لەوتنەوەی  ملیۆنێك جار بیلێرەوە ، با من پێتان بلێم ئێوەی موسلمان رەحمەتی الله تعالی تان لێی بیّ لەو فاتیحەی کە ئەیخوێنن بێزار ئەبن ؟! لەشەو و رۆژێکدا چەند جار دەیخوێنن ! ! لیّ بێزار نابیّ ، بەس وەرە قسەی کەسێك بلێرەوە بزانە بێزار و وەرەس دەبیّ یان نا ! کەچی لەم قورئانە پیرۆزەدا بێتاقەت نابی .

إبن كثير (رەحمە الله ) دەفەرموویی لەدرێژەی تەفسیرەکەیدا : (فنسأل الله الكريم المنان القادر على ما يشاء ، أن يخلصنا مما يسخطه ، ويستعملنا فيما يرضيه، من حفظ كتابه وفهمه ، والقيام بمقتضاه آناء الليل وأطراف النهار ، على الوجه الذي يحبه ويرضاه ، إنه كريم وهاب .) دوعایەکی زۆر جوان دەکا : ئەلیّ داوا ئەکەم لەو خوایەی کەوا سەخیە و بەخشندەیە داوا دەکەم لەو خوایەی کەوا پێمان دەبەخشی و بەتواناشە بمانداتیّ وە لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە   کەرزگارمان کات لەوشتەی کەوا خۆی رقی لێی یەتی (خوایە رزگارمان بکە لەوشتەی کەوا خۆت رقت لێی یەتی )، وەهەروەها دەلیّ : بمان گێر بەو کەسانەی کە کار دەکەن لەو شتەی کە خۆیی لێی رازییە کار لەو شتە بکەین  ، کار لەوشتانە بکەین کە الله تعالی خۆی پێی رازییە نەك لەشتێکدا بمان بینێتەوە کە لێمان رازی نەبیّ ، ئەویش بریتیە  لە حفظی کیتابەکەی بۆیە داوا دەکەم لەمامۆستایانی بەرێز گرینگیەکی زۆر بەو قوتابیانە بدەن بەوتەمەنە جوان و نەمامانە ئا لەو سەرتایەوە لەبەر کردن و حفظیان  زۆر بەقوەتە مندالان هەروان هەتاوەکو دەگەیتە ٢٠ سالی  حفظەکەت بەقوەتە هەروەکو چۆن مسجیلێك تنزیل دەکەی هەروایە با گرینگیان پیّ بدەین با لەبەری بکەن وە لەدوای ٢٠ سالیەوە فەهم دروست دەبیّ  لەبەر کردن کەم دەبێتەوە ئێستا بە ئێمە و مانان بلیّ دوو کەلیمە لەبەر بکە هەتاوەکو لەبەری دەکەین زۆر نارەحەت دەبی و نارەحەتە بۆت لەبەر ناکرێی ، بەس ئەو مندالە ماشا الله لەبەر دەکا بۆیە قورئانیان پیّ لەبەر بکە برێی وەرە دانیشە گولەکەی من دانیشە چاوەکەم

وەرە ئەم قورئانە لەبەر بکە بەیانی دواتر دوعای خێرم بۆ دەکەی ، ئەلێ هەزار رەحمەتت لێی بێ مامۆستا تۆ ئەو قورئانەت پێ لەبەر کردم تۆ ئەو رێگەیت نیشان دام.

شێوازی مامۆستایەتی شێوازی وتنەوەی قورئان شێوازی تایبەتی خۆی هەیە هەر ئەوەندە نیە لەبەر خاتری حیزبێك و جەماعەتێك بێت و مەجموعەیەك کۆ بکەیتەوە بۆ ئەوەی لێمان عاجز نەبن چۆن بێ کێشە نیە ! نەخێر بەڵکو تۆ وەرە بۆ قەبرەکەی خۆت کار کە کەس نایتە قەبرەکەت نە رەئیس حزبەکەت نە کورەکەت نە ژنەکەت نەکچەکەت نەرەئیسەکەت وە نە ئەو بۆنە خۆشەی بەخۆتیەوە ئەدەی مەگەر لێت دەن بۆخۆی نایی ، لەبەر ئەوە ئاگادار بە بزانە عەمەلەکەت چۆنە وە ئەوەش گرینگە کە بۆ الله ی دەکەیت، تۆ وەرە قورئانی پێی لەبەر بکە وەرە زمانی راست بکەرەوە بە قورئان ، زۆر بەی زۆر نازانی فاتیحە بخوێنێتەوە با هەر دانیشتن نەبێ ، هەر بلێت ئێمەی فرقە و جەماعەتی فلانین نەخێر بەڵکو ئێمە موسلمانین پارچە پارچە نین ئەوەی خۆی پارچە پارچە بکا الله تعالی رقی لێ هەلدەستێنێ ئەفەرمووێی : (مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ)[١٩] ئێمە موسلمانین تۆ برای منی و منیش برای تۆم .

بەس ئەمرۆ ئەگەر بێتە فیرقە فیرقە و جەماعەتی فلان بەس فلان وە جەماعەتی فیسار بەس فیسار ، تخوا ئەوە راستە لەناو ئەو عالەمەدا کوفر بەو شێوەیە یەك دەگرێی وەلەو لەنێو خۆشیدا جیاواز جیاوازە بەلاّم تۆپ و تەیارەکەی بۆتۆی موسلمان فرێی ئەداتە خوارەوە کەچی موسلمان هەزار پارچە بێ موسلمان ئەلێ :یارەبی الحمدلله کە موسلمانەکە وای لێهات ، ئەلێ قەیناکە موستەحەقیانە با بیخۆن ، لەجیاتی بلێ خوایە رەحم بە موسلمانان بکەی ، (یاالله رەحمان پێی بکەی زۆر بێ کەسین ئێمە کەسمان نیە لەتۆ زیاتر یا الله شەرق و غەرب لەسەرمان کۆبۆتەوە ، یا الله موسلمان بکەی بە یەك یا الله بیان کەیت بە یەك پارچە یا الله سەرکردەیەکی لەخواترسیان بۆ بنێری شەرق و غەربت بۆ بخاتە ژێر عەرزەوە ) بەم شێوەیە دوعا بکە هەتا تۆ وابی من جەماعەتی فلانم من جەماعەتی فیسارم من جەماعەتی فیسکەم من جەماعەتی ئەوەم هیچ بە هیچ نابێ ،

---

[١٩] :شورة الروم اية : ٣٢

الله تعالى لەقورئاندا دەفەرمووێی : (وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا)[20] تەنازوع بکەوێتە نێوانتان فەشەل دەهێنن ، بەخوا لەگەل پێغەمبەریشدا بی (صلى الله عليه وسلم) فەشەل دەهێنی ، لە ئوحود توشی هاتن یاخود نا ! مەبەستم لەو کەلیمەیە بریتیە : ئەوەیە کە الله تعالى دەفەرمووێی : (قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ ۗ)[21] لە ئوحود بەس بەقسەی پێغەمبەریان نەکرد (صلى الله عليه وسلم)لەو تۆپەلکایە و گردە مەینە خوارەوە ، کەچی هاتنە خوارەوە بینیان کافرەکان ژێر کەوتن رایانکرد بۆ غەنیمە ، والله صەحابە ئەلێ هەتا ئەو رۆژە نەمان زانی تیاماندایە دونیاوییە ، کەچی الله تعالى فەرموویی : (مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا)[22] ئەی صەحابەکانی پێغەمبەر کەستان هەیە دونیایی دەوێی لە ئێوە ، ئەوها مەبن بەم شێوەیە جا لەوان وابن ئەبێ لەمە چۆن بن بە هەزار جار لە ئێمەش وا دەبن ئەبین بەهیچ ، مامۆستایانی بەرێز دێن ئەم پەندە جوانە بۆ خەلك باس دەکەن قوتابیان ئەگەر هاتوو یەك چیلکەمان هێنا ئەتوانین بیشکێنین ئەگەر دەمان کرد بەیەك ناتوانین ، ئێ دە جێ بەجێ بکە براکەی من .

پاشان إبن كثير دەفەرمووی : (وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ الْمُجْرِمِينَ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا (٣١))( أي : كما حصل لك – يا محمد – في قومك من الذين هجروا القرآن ، كذلك كان في الأمم الماضين)چۆن بۆتۆ دروست بوون کەسانێك لە قومەکەت بونە دوژمنی تۆ وازیان لەقورئانەکە هێنا ئومەتەکانی پێشووش وابوون دلت لەخۆت دانەمێنی ئەم رێکەیە هەروایە و هەرواش دەبێ ، (لأن الله جعل لكل نبي عدوا من المجرمين) چونکە بۆ هەموو پێغەمبەرێك الله تعالى دوژمنی داناوە (يدعون الناس إلى ضلالهم وكفرهم)خەلکی بانگەواز دەکەنە سەر گومرایی و کوفر و هیچ و پوچەکەی ژیانی خۆیان.

إبن كثير ئایەتێك دەهێنی و دەفەرمووێی :(وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ)[23] ،

[20] :سورة الأنفال اية : ٤٦
[21] :سورة ال عمران اية : ١٦٥
[22] :شورة ال عمران اية : ١٥٢
[23] :سورة الأنعام اية :١١٢

(وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ) ئێمە گێراومانە بۆ پێغەمبەران یەکێك لە دووژمن لە شەیطانەکانی ئینس و جن ، نەلێ دووژمنەکەم تەنها ئینسانە شەیطانەکانیش ئەبێ بەدووژمنت بەجنۆکە و بەئینسان هەمووی بۆت راوەستاوە وەکو سەگ و گورگ ئەیانەوێ بتخۆن (يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ۚ)

(يُوحِي)فعل مضارعە بەبەردەوام خەریکی نیگا کردنن بۆیەکتری قسەی هیچ و پوچ ئەهێنن و ئەیکەن بەگوێی بەیەکتری و رێگەکەی تۆ وێل دەکەن لەخەلکی بۆ ئەوەی خەڵکی سەرلێشواوی هەلخەلەتاندن بکەن (وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ) ئەگەر الله تعالی بیویستایە ئەوان ئەوەیان نەئەکرد ، بەس خوای تبارك وتعالی ئەم ئیشە ئەکا بۆ ئەوەی سەبری تۆ تاقی بکاتەوە بۆ ئەوەی بزانی تۆ لەو مەیدانەدا بەرێك و پێکی ئەرۆی بەرێوە و سەر ئەکەوێی یاخود نا (ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ) لێیان گەرێی چ درۆیەك دەکەن با بیکەن چ شتێکت بۆ هەلدەبەستن با بیکەن گوێمەدەرە قسەیان ، پێت ئەلێن موجریم یان ئیرهابی هەرچیان وت گوێیان مەدەرێی ، ئەگەر گوێیان بدەیتێ ناتوانی هیچ بکەیت (ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ)

(وَلِتَصْغَىٰ إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ)[٢٤] ئەو قسانەی کە ئەوان ئەیکەن دژی ئیسلام و موسلمانان و قورئان با کەسانێك گوێی بۆ بگرن کە ئیمانیان بە ئاخیرەت نیە ، ئینسانی موسلمان نابێ گوێی بۆ بگرێی نابێ تەئسیرت لێ بکا برای خۆشەویستم (وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ)با بەو قسانە رازی بن با کارو وتەی خراپ ئەنجام بدەن چی ئەنجام ئەدەن با ئەنجامی بدەن ئەی ناگەرێنەوە بۆلای الله تبارك وتعالی !

لەم ئایەتاندا زۆر پەندی تێدایە بۆ ئێمە کە خۆراگربین قسەی خەلکی کارمان تێ نەکا بەس بەداخەوە قسەی خەلك کارمان تێ دەکا .

إبن كثير دەفەرموویێ : (ولهذا قال هاهنا :)لێرە پێت دەلێ : (وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا) أي : لمن اتبع رسوله)بۆ ئەو کەسەی شوێن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەوێی بەسە کە

[٢٤] :سورة الأنعام اية : ١١٣

الله تعالى ڕێنموپای بکات و سەریشی بخا هەردووکی پێکەوە باس کردوە ڕێنمایت دەکا وە سەریشت دەخا (وآمن بكتابه وصدقه واتبعه) ئیمانی بە کیتێبەکەی هێناوە بڕوای پێکردوە و شوێنیشی کەوتوە و بەقسەشی کردوە (فإن الله هاديه وناصره في الدنيا والآخرة .) الله تعالى لەدونیا و لەقیامەتیش ڕێنمایی دەکا وە سەریشی دەخا .

(وإنما قال : (هَادِيًا وَنَصِيرًا))وە ئەلێ ڕێنمای کەر و سەرخەرە لەبەرچی ؟ (لأن المشركين كانوا يصدون الناس عن اتباع القرآن)چونکە موشریکەکان خەڵکیان دوور دەخستەوە لەشوێن کەوتنی قورئان (لئلا يهتدي أحد به)تا کەس ڕێنمای بەو قورئانە وەرنەگرێ وە ڕێبازی ڕاست وەرنەگرێ ، لەپاشان کە دەبێتە گەورەی قەوم ئەبێتە گەورەی ئەم سەر زەمینە (ولتغلب طريقتهم طريقة القرآن) بۆ ئەوەی ڕێگەکەی ئەوان زاڵ بێ بەسەر ئەم قورئانە ، ئەمڕۆش وایە بۆچی ڕێگە لەقورئان ئەگیرێ ؟! بۆ ڕێگە لەمزگەوت ئەگیرێ بۆ ڕێگە لەوە ئەگیرێ منداڵان کۆبکەیتەوە قورئانیان پێی بڵێ چونکە ئەگەر ئەوە بڕوا بەڕێوە ڕێگەکەی ئەوان بەطاڵ ئەبێتەوە .

(؛ فلهذا قال)لەبەر ئەوە الله تعالى فەرمووی : (وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ الْمُجْرِمِينَ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا) الله تعالى بۆ هەموو پێغەمبەرێك موجریمێك و دووژمنێکی داناوە (وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا) بەسە کە الله تعالى ڕێنمای دەرت بێ و سەرت خا .

وەکو وتمان قورئانی پیرۆز فەرموودەی الله تبارك وتعالى یە ، الله تعالى پەیوەندی لەنێوان و ئێمە و ئەودا بەو قورئانە گرێیی داوە لە ئێستا چونکە پێغەمبەر نەماوە (صلى الله عليه وسلم ) تاوەکو بچین بۆ لای ،بلێین ئەی پێغەمبەرەکەی خوا (صلى الله عليه وسلم) خوا چی دەڵێ پێمان بڵێ ! ئێمە ئەم قورئانەمان لەبەیندایە ، کەسێك کەسێکی خۆش بوێ حەز لەقسەکەی دەکا وە بەقسەشی دەکا ئێمەش دەبێ وەکو موسلمان و ئەیلێینەوە ئەبێ وابێ و خوامان لە هەمووان خۆشتر دەوێ ، الله جل وعلا لەهەمووان گەورەترە ، بەئەتەکید ئەبێ کەلامەکەشی لەپێش هەر هەموو کەلامێکەوە بێت ، ڕێز لێگرتن و حورمەت و ئیحترامی و لەبەرکردن و

خوێندنەوەی و ئیمان پێهێنانی وەکو إبن کثیر (رحمه الله ) فەرموویی : لەگازندەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کەوتی (وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَٰذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا)[٢٥] واتا : تۆ ئەو قورئانەت بۆ ئێمە هێنا ئەو قومە پشتی تێکرد و لێی تۆراوە لەقورئان تۆراون ، ئێستاش ئەوە هەموو عالەم زۆرینەی بە قورئان تۆراوە ، لەسەر ئەم ئەرزە دەولەتێکم بۆ بێنە وە کەسانێکم بۆ بێنە کە غەم و هەمیان ئەم قورئانە بێ و بەرزی بکەنەوە بلێن موسلمانین وەرن با لەژێر سێبەری ئەم قورئانەدا ژیان بەرینە سەر ، مەگەر کەسانێك هەبن لەبەر خاتری الله تعالی بەتاك یاخود کەسانێك هەبن لەولا و لەولا بەڵام بزانە خەڵکی چۆن سەیریان دەکەن ! هەر قورئانت پەرز کردەوە بەچاوێکیتر سەیرت دەکەن ، کە ئەمە ئەو پەری بەد بەختی خەڵکە ئەگەر پشت کەنە قورئانەکەی الله تبارك وتعالی .

قورئان بۆچی هاتوە خۆشەویستانم ؟

دەی پێم بلێن ؟! بۆ ئەوە نەهاتوە بیکەینە دەستوری ژیانمان ؟! بۆ ئەوە نەهاتوە بیکەینە حوکمرانی لەنێوانمان ! ؟ بۆ ئەوە نەهاتوە بیکەینە لابردنی خەم و خەفەتەکانمان ؟!

قورئانی پیرۆز وەکو زانایان دەفەرموون : هەمووی باسی یەکخوا پەرستیە (التوحيد) هەمووی لەوشەی یەکخوا پەرستی کۆدەبێتەوە ، یەك خوا بپەرستن ، وە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەبەر خاتری ئەمە هاتوون .

## بەشی یەکەم :

الله تعالی کە ئەم سەر زەمینەی داناوە وە پێغەمبەرانی ناردوە ناو بەناو لەدوای یەك قومەکە لەکەلامی الله تعالی دوور کەوتونەتەوە وە ئەوەی الله تعالی پێی وتون دوورکەوتینەوە لێی ، هاتووە پێغەمبەرێکی لەگەل ناردوە و کیتابێکیشی بۆی رەوان کردوە بەو کیتابە پێی وتوە شوێن ئەم کیتابە بکەون وە ئەم کیتابەش هەمووی باسی یەکخوا پەرستیە .

---

[٢٥] سورة الفرقان اية : ٣٠

لەبەر ئەوە قورئان کەتەلۆکی سەیارە و تەیارە  و هەندەسەی فلان شت وفلان شت نیە وەکو زۆر کەس باسی لێوەدەکا ئاگادارین ، هەمووتان ئەوەتان خوێندۆتەوە کە الله تعالی ئەفەرمووی : (ذَٰلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ)[٢٦] (هُدًى)رێنماییە بۆ بەهەشت رێنماییە بۆ بینینی الله تعالی وە رێنماییە بۆ رزگاربوون لە جەهەنەم وە رێنمایی و سەرمەشەقە بۆ ئەوەی لەدونیادا بیکەیتە رێبازی خۆت و لەسەری هەنگاوەکانی ژیانت بە پێی ئەوامیر و نەواهیەکانی بنێت و واز لە هەموو شتێکیتر بهێنی ، بەس ئەمرۆ بەداخەوە لەناو واقیعی ئێمەدا بەم شێوەیە کە دەیبینی ئەم قورئانە پشتمان تێکردوە.

إبن کپیر فەرمووی : ئەگەر ئیمانی پێی نەهێنی پشتت تێکردوە .

ئەوەتا زۆربەی زۆری حوکمات ئیمانی پێی نیە ، ئیمان هەر ئەوە نیە بلێ قورئان لای خوایە ! ئەوەیە کە ئیشی پێی بکەی ، کوا ئیش بەقورئان ئەکرێی ، پاشان ئەگەر ئیشی پێ بکا دەبێ بۆ الله  بیکا نابێ لەبەر خاتری هیچ کەسێکیتر بیکا حەدیسمان هەیە ، ئەفەرمووی : کەسێك دەهێنرێی لەرۆژی قیامەت قورئانی هەموو لەبەرە جوان ئەیخوێنێتەوە ئیشی پێکردوە ئەلێ ! الله تعالی پێی دەفەرمووی : تۆ چیت کردوە لەدونیادا ؟! ئەویش ئەلێ: قورئانەکەی تۆم خوێندەوە و ئیشم پێی کرد . ئەلێ درۆ ئەکەی بۆ ئەوەت کرد کە خەلکی پێت بلێ ئافەرین ! بۆ ریا و سومەع کردت تاوەکو پێت بلێن عالمێکی بەرزە !برۆن بیخەنە ناو جەهەنەمەوە ، یەکەم کەس ئەوانە ئەخرێنە ناو جەهەنەم !

ئەمە خوێندویەتەوە و ئیشی پێی کردوە بەس مەبەستی الله تعالی نەبووە پێی ، مەبەستی ئەوە بوو پێی بوترێی عالم ، ئەی ئەوە کە پشتی تێکردوە و هەر گوێشی ناداتێ وە هەر ئیشیشی پێی ناکا بەلکو بگرە ئەگەر کەسێك ئیشی پێی بکا بەو پەری موجریمی لەقەلەم دەدات ! ئەمرۆ وانیە !؟ ئیش بەقورئان بکرێی وە کەسێك بیەوێی ئیش بەقورئان بکرێی ئەوە کەسە بەچ لەقەلەم ئەدرێی  من بەئێوە دەلێم ؟! بەو پەری ئینسانی تاوانبار و موجریم لەقەلەمی ئەدەن و ئەلێن نابێ وابکەی !ئەلێن : قسەی خەلك لەپێش قسەی خواوەیە .

---

[٢٦] سورة البقرة اية : ٢

ئەفەرموون : ئەم قورئانە هەمووی لەبارەی یەکخوا پەرستیەوەیە وە دەکرێی بەسێ بەشەوە ئاگاداربن ، ئەمە چەند جار ئەم قسەیەمان کردۆتەوە بەس هەر دەمانەوێی بیکەینەوە چونکە وتنەوەی ئەم جۆرە قسانە لەدلدا با جێگیر ببێ تاوەکو بزانی قورئانەکەت باس لەچی دەکا !

قورئانەکەت یان باس لە (رب العالمین) دەکا ئەو پێت ئەلێ من تۆم دروست کردوە من تۆم بەخێو کردوە وە من تۆ بەرێوە دەبەم وە من کەون و کائیناتەکەت بۆ بەرێوە دەبەم وە من بارانت بۆ دەبارێنم وە من زەویت بۆ سەوز دەکەم وە من هەموو شتێکم بەدەستە کەس هیچی بەدەست نیە لەمن زیاتر دە بمپەرستە ! دە من خوای تۆم بەقسەی من بکە بەقسەی کەسیتر مەکە (أن لَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ)[27] کەسیتر مەپەرستن و بەقسەی کەسیتر مەکەن وە لەسەر رێبازی کەسیتر مەڕۆن إلا الله تعالى نەبێ ، قورئان باسی ئەمەت بۆ دەکا ، هەر لەباسی ئەمەدا کە تەوحید و یەکخواپەرستیە باسی ئەوەت بۆ دەکا کە پەیوەستە بە (رب العالمین) پێت ئەلێ ئەوە ناو وسیفاتی جوانی هەیە وە ناوی جوان و سیفاتی بەرزی تێی بگە و بزانە و لەخوای خۆت شارەزابە ، الله تعالى خۆی پێت ئەناسێنی ، تۆش برۆ لەقورئانەکەی الله تعالى بناسە ! بزانە خوای تبارك وتعالى بەشەرە ؟! نەخێر بەشەر نیە ، خوای تبارك وتعالى هەرچیەك تۆ تەسەور دەکەی ئەوە نیە باش ئاگاداربن ، الله تعالى دەفەرمووی : (لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ)[28] نە ئەولادی هەیە و نەدایك و باوکی هەیە ، هیچ کەس وەکو الله تعالى نیە .

ئێمە ئیمانمان پێی هێناوە تۆ هاتووی ئیمانت بەم خوایە هێناوە تۆ ئەیسەلمێنی نەخوات بینیوە وە نەگوێت لەخوا بووە تەنها قورئانەکە لەنێوانماندا هەیە ، ئەم قورئانە پێت ئەلێ من بەشەر نیم ، ئێستا زۆربەی زۆری ئینسانەکان لەسەر ئەو زەویەی کێن ؟ کەوا دینەکیان هەبێ و دینەکەشیان ئەو پەری پرو پوچ بێ نەصرانیەکان و گاورەکانن ئەمریکا و ئەورووپار و ئەوانیترە هەمووی ئەلێ خوا کوری هەیە (والعیاذ بالله) خوا ژنی هەیە ! خوا سێی یە ! دەلێن وا یەکێکە لە سێی یەکە ، ئێمەی موسلمانیش لە سورەتی الاخلاص دەلێن : (لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ

---

[27] : سورة هود اية : ٢٦

[28] : سورة الإخلاص اية : ٣-٤

(٣) وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ) تۆ هاتى بەوان دەلیٚ : درۆ دەكەن خوا جل و علا نەكورى هەیە وە نەكچى هەیە وە نەدایك نەباوكى هەیە هیچ وەك خوا نیە .

بزانە تۆ ئەمرۆ ریٚژەیەك وەربگرە بزانە زۆرترین كەسانیٚك كە دینەك ئەبەن بەریٚوە گاور و نەصرانیەكانن وە لەموسلمانان ژمارەیان زۆرترە ، بەلاٚم قورئانەكەى ئیٚمەش بەم شیٚوەیە دەلیٚ كە وتمان كەواتە ئەمانە قومیٚكى كافرى موشریكن ،ئەوانە خواى تبارك وتعالى دەربارەیان دەفەرموویٚ : (وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ)[29] عیسا نەكوژرا و صەلب نەكرا وە لەخاچ نەدرا ، كەچى ئەوان ئەلیٚن نەخیٚر خوا راست ناكا عیسا لە خاچ و صەلب دراوە ، ئا ئەوەیە كە تۆ پیٚى دەلیٚ ئەمریكا هاتوە ئیٚمە رزگار بكا !! ئەروپا كە پیٚشكەوتن و نویٚگەرایى دەویٚ !!

باشە تۆ ئەگەر لەگەل الله تعالى پەیوەندیت خراپ بوو با هەموو ژیانت زیٚر و زیوو بیٚ با هەموو ژیانت خواردنى خۆش و جلى جوان بیٚ كە مردیت و چویتەوە لاى خواى جل وعلا بۆلاى جەهەنەمیٚكى هەتا هەتایى ناردى چ سودیٚكى هەیە بەس پیٚم بلیٚن !!

هەركەسیٚك لەدلیدا خۆشەویستى ئەوكەسانە هەبیٚ بەهیچ شیٚوازیٚك ئیماندار نیە هەزار نویٚژ و رۆژووش بكا الله تعالى دەفەرمووى : (لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ)[30] ئەمەیە ئینسانى موسلمان خۆشەویستانم .

دواتر وەرە سەیرى یەهود بكە كە ئیٚستا زۆرینەى هیٚزى ناوچەكەى بەدەستە كەس ناویٚرى بچیٚت بەلایدا تۆزقالیٚكن كەمایەتیەكن لەناو ئەم بونەوەرەدا وە یەكیٚكن لە كەمینترین لەو دینانەى كە لەسەر ئەم زەویەدایە بەلاٚم بزانە بەهیز و قوەت چەند بەهیٚزن بەحیسابى خۆیان !! ئیشەكەیان بریتیى نیە لەئازایەتى و بویٚریى ئیشەكەى ئەوان وە سرى سەركەوتنى ئەوان یەك شتە ئەویش بەئیٚمە وتراوە لەقورئان و حەدیسەكەماندا الله تعالى لەقورئانەكەماندا پیٚى

---

[29] : سورة النساء اية : ١٥٧
[30] : سورة المجادلة اية : ٢٢

وتوین : كه ئەوانە ترسنۆكن بەس كاتێك ئێوە لەدین لاتاندا ئێوە ترسنۆك ئەبن و ئەوان بەهێز و ئازادەبن ، سەر بەرزیی ئێوە و ئازایەتی ئێوە ئەی ئومەتی ئیسلام لەدینەكەتاندایە كاتێك دینەكەتان فرێی دا ترسنۆكترین كەس دەردەچن ، وە ترسنۆكەكانیش ئازاترین كەس دەردەچەن ، ئێستا وایە.

دەی تۆ بگەڕێرەوە بۆ لای دین بزانم كێی پێت ئەوێریی ؟! بەدەقی فەرموودە هاتووە : ئەگەر تۆ دینەكەت بەجێهێشت الله تعالی زەلیلت دەكا ، ئەو زەلیلیەت بەسەردا زاڵ دەكا لایی نابات الله تعالی تاوەكو نەگەڕێتەوە سەر دینەكەت .

ئەم قورئانە بەم شێوەیە باسی ئەسمط وصیفات دەكا دەلێت : الله كوری نیە كەچی ئەوان دەلێن كوری هەیە ! یەهود دەلیٚ عوزێر كوری خوایە ! وە لەولایەوەش نەصرانی دەلیٚ عیسا كوری خوایە ! تەنهانەت هەردووكیان دەیانوت : (وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَىٰ نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ ۚ)[31] نەك هەر ئەوەندە بەڵكو یەهود و نەصرا دەلێن ئێمە كوری خواین !! ئێمە كوران و خۆشەویستانی خواین ! الله تعالی بە پێغەمبەر دەفەرمووی (صلى الله عليه وسلم) دەبلیٚ خوا بۆ تەعزیبتان ئەدا بەدەستی ئێمە كەواتە ؟! .

سەیری شەجاعەتی پێغەمبەر بكەن (صلى الله عليه‌وسلم) ئەمری فەرموو یەك كەس لەیەهود نابیٚ لە جەزیرەی عەرەب بیٚ لەموشركین نابیٚ لەوێی بن هەموویانی مل شكاند ، یەك كەس نەمایەوە لەئاستی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەكۆتایی ژیانی ئەوەشی مایەوە ئەمری فەرموو كەنابێت بمێنن . عومەری كوری خەتاب(رەزاو رەحمەتی الله تعالی لیٚ بیٚ ) هەموویانی دەركرد ئەوە تۆلەی ئەوەیە كەوا ئێستا لەئێمەی دەستێنەوە !

لەكاتی ئازایەتی و شەجاعەت دا توانیمان ئومەتی ئیسلام توانیان ملیان بشكێنن و دەریان بكەن لەولاتیشدا بەلاٚم لەكاتی زەلیلماندا ئەوان هاتن و زاڵبون بەسەرماندا .

بەچی تۆ ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم عیزەتە بەم دین و ئیمانە و بەم قورئانە تۆ ئەگەڕێتەوە .

---

[31] : سورة المائدة اية : ١٨

## بەشی دووەم :

باسێکیتر قورئان باسی بکە و بلیٚ و مەکە و مەلیٚ ئەکات :

بکە و بلیٚ وە مەلیٚ و مەکە ! واتا ئەوەشتەی کەوا پیٚت ئەلیٚ و ئەمرت پیٚ دەکا وە ئەوشتەی کەوا نەهیت لیٚ دەکا ، ئەمانە حقوق و مافی تەوحیدن ، مافی ئەو یەکخوا پەرستیە پیٚت ئەلیٚ نویٚژ بکە ! وە پیٚت ئەلیٚ رۆژوو بگرە ! وە پیٚت ئەلیٚ زەکات بدە وە پیٚت ئەلیٚ حەج بکە ، کەچی لوت بەرز دەکات و ئەلیٚ نایکەم ! نایکەی لوتت دەشکیٚنی ئاخر الله تعالی ، باشبزانە الله تعالی پیٚویستی بەم نویٚژ و رۆژووی تۆ نیە ، پیٚویستی بەئیٚمەیە !؟ تۆیەکی دروست کردوە لەناو ئەم کەونەدا پیٚت ئەلیٚ بەقسەم بکە ئەتخەمە بەهەشت وە بەقسەم نەکەی ئەتخەمە جەهەنەم تەواو هەر ئەوەندەیە ، نایکەی خۆت زەرەر دەکەی کیٚ زەرەر دەکا خوا زەرەرناکا هەرخۆت زەرەر دەکەی ،! شەیطان نەیکرد کیٚ زەرەری کرد ؟ ئەی لەبەهەشت نەبوو ؟! نەیهیٚنایە دەرەرەوە ؟! ئەی هەتا هەتایە بۆ جەهەنەم ناروا ؟! خۆیی زەرەری کرد ، جا ئەوەی لوتی بەرز بیٚ لەئاستی دین خۆی لوتی ئەشکیٚ و لوتی خۆی ئەشکیٚنی ، الله تعالی موحتاجی کەس نیە .

لەگەورەترین ئەوامیر و فەرمانەکان بریتیە لەچی؟ لە (لا اله الا الله محمد رسول الله صلى الله عليه وسلم) نویٚژ و زەکات ، لەحەدیثی صەحیحی بوخاری و موسلیم پیٚغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی :( أمرت أن أقاتل الناس) سەیری ئەم پیٚغەمبەرە ئازایە بکە (صلى الله عليه وسلم) : ئەو پیٚغەمبەرە بەجەرگە ئەو پیٚغەمبەرە نەترسە (صلى الله عليه وسلم) ترسنۆك نەبوە ئەلیٚ : ئەمرم پیٚکراوە هەرچی لەسەر ئەم زەمینەیە ملی بقرتیٚنم و لەملی بدەم و سەری ببڕم ! (أمرت أن أقاتل الناس)یانی چی ؟ (أمرت)کیٚ ئەمری پیٚکردوم ؟ الله ، ئەو خوایەی کە کەونی دروست کردوە بە پیٚغەمبەرەکەی(صلى الله عليه وسلم) دەلیٚ من ئەو موشریکانەم ناویٚی برۆ سەریان ببڕە ، نامانەویٚ ، ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) برۆ یەك کەس مەهیٚلەوە ، ئەو عیبارەتەی تیٚدانیە هەرکەسە و بەدینی خۆی ! شتی وا نیە ، (أمرت أن أقاتل الناس)هەتا کەی ئەی پیٚغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ؟

دەفەرمووی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) : (حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، وَأَنَّ مُحَمَّدا رَسُولُ اللّهِ. وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ.)[32] ئەلێ : ئەبێ هەموویان شایەتی حەق بدەن بلێن لە الله تعالى نابێ کەسیتر بپەرسترێی وە محمدیش رابەرە (صلى الله عليه وسلم) عەمر و زەید رابەر نیە ئەگەر وتت خوا پەرستراوی من و یەکێکەش لەملی بدە ، ئەگەر وتی خوا و یەکێکە و دوانیکە و سێیانی کە لەملی بدە نابێ لەگەل الله دا کەسیتر هەلبژێردرێی (لا اله الا الله) (أَن لَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ)[33] کێ رابەرتە و کێ ئەو پەیامەی کە الله هێناویەتی رۆشەنیی دەکاتەوە ؟! پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)کەواتە ئەبێ بروات بەوە هەبێ کەوا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) رابەری تۆیە ، (وَأَنَّ مُحَمَّدا رَسُولُ اللّهِ)پاشان نوێژ دەکەی ؟! ئەگەر ئەمەت وت تەواو ؟ نەخێر بەلکو تەواو نیە بەلکو ئەبێ نوێژیش بکەی ،ئەی ئەگەر نایکەی لەملی بدە ، بە ئیتفاقی زانایانی ئەهلی سونە إلا هەندێك نەبێ لەملی ئەدرێی بەس ئایە بەکافری ئەروا ئەمە زانایانی دواین وتویانە نا بەموسلمانی ئەروا !! بەلاّم صەحابە هەمووی ئەلێ : بەکافری ئەروا ، زەکات  یا نوێژیش بکات موسلمانە و زەکات نەدا ، زانایان دەفەرموون : سەیری ئەبو بکر صدیق بکە (رەزا و رەحمەتی الله تعالى لێ بێ )کە لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە زەکاتیان نەدا (بنى حنیفە)چی لێکردن ؟! شەری ریدەتان نەبیستوە ؟! قەومەکە نەیانوت ئێمە زەکاتمان ئەدا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەس نایدەین بەتۆ ئەی ئەبو بکر ، ئەبو بکر جەیشی ئامادە کرد ، عومەر (رەزاو رەحمەتی الله تعالى یان لێ بێ )وتی :

سبحان الله ئالێرەدا عومەر جیاواز بووە لەهەموو کاتەکانیتر ئەگەر تۆ سەیری بکە لەکاتیتردا زۆر لەسەر حەق رەق بووە ، مانای ئەوە نیە تۆ عومەرێکت بێتە بەرچاو کەسێکی تورە و مۆن بووبی و خەلك لێ ترسابێ ! نەخێر بەلّکو لەسەر حەق رەق بووە ، ئەلێن : قسەم حەقە بۆیە رەقە ، بەلاّم عومەر (رەزاو رەحمەتی الله تعالى لێ بێت) نەرم و نیانێکی نواند !

[32] فأخرجه مسلم حديث (٢٠)
[33] : سورة هود اية : ٢٦

وتی: ئەبو بکر چۆن تۆ کەسانێك دەکوژی نوێژ دەکەن و ئەلێن (لا اله الا الله محمد رسول الله صلی الله علیه وسلم) بروایان بەخوایە و نوێژ دەکەن  هەر لەبەر ئەوەی تەنها زەکات نادەن !؟ ئەبو بکر الله تعالی ئەم دینەی پێی پاراست وتی : عومەر ئەوەی فەرق و جیاوازی لەنێوان نوێژ و زەکات بکا لەملی ئەدەم ، نابیٚ جیاوازی لەنێوان نوێژ و زەکاتدا بکا نوێژ دەکا دەبیٚ زەکاتیش بدا ئەوە بوو چوە سەریان و قەتل و عامی کردن بە ئیجماع و کۆدەنگی هەموو صەحابە ،

نوێژیان ئەکرد ئەوان وەبانگیان ئەدا وە مزگەوتیان هەبوو ئەیانوت (لا اله الا الله محمد رسول الله)هەموو شتەکانیان ئەکرد تەنها زەکات نادەین ؟! ئەبو بکر وتی زەکات نادەن ؟ صەحابەی کۆکردەوە عومەر و عثمان و عەلی لەپێش هەموویانەوە برۆ لێیان بدەن .

ئەها خۆشەویستانم ئەوان چۆن بوون !! ئەوە لەکاتێکدا جەیشێکیان ئامادە کردوە بۆ ئەوەی بۆ رۆم بروا ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێش ئەوەی وەفات بفەرمووێ ئازایەتیەکەی ئەوەندە گەورە بوو جەیشی ئوسامەی ئامادە کرد پێش ئەوەی وەفات بکا بە ئوسامەی فەرموو ئەو جەیشە ئامادە بکە برۆن بۆرۆم و شەری رۆم بکەن لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کرد ئوسامە مایەوە و نەرۆیشت ، دواتر ئەبو بکر فەرمووی : جەیشێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دایناییٚ ئەبیٚ هەر بروا بەلاَم ئێمە دەبیٚ جارێی ئاگامان لەناوەخۆش بیٚ نابیٚ کێشە لەناوەخۆ هەبیٚ کێشە لەناوەخۆ هەبیٚ ئەو جەیشە برواتە دەرەوە کێشەش لەناوەخۆ هەبیٚ ئینهیاردەکەین و دەروخێنن ! صەحابەی کۆکردەوە و شەری لەگەل ئەوان کرد .

ئەوە بوو ئازایەتی و بەجەرگی صەحابەکان (رەزا و رەحمەتی الله تعالی یان لیٚ بیٚ )بۆیە هەتا ئەوان پیاو بوون کەس پیاو نەبوو لەئەهلی دینەکاتیتر هەموویان سەرشۆر بوون لەئاستیان ، بەس کە ئەو پیاوانە نەمان ئێمە ئاوامان لێهاتوو و زەلیل بووین .

ئەوە ئەوامیر و حقوقەکانی تەوحید ، بەلاَم لەوانەیە یەکێك بلیٚ : ئەی ئەگەر کەسێکی تاك زەکاتی نەدا ئەوە ئەگەر کۆمەلێك بون و حەربیان لەگەل دەولەتی ئیسلام کرد و وتیان زەکات

نادەین با نوێژ و ڕۆژووش بگرن وایان لێ دەکرێی بەس ئەگەر یەکێك بەتەنها زەکاتی نەدا عقوبەیەکیتریی هەیە پێی ناوترێی کافر ئەگەر بڕوای بەزەکاتەکە هەبێ پێی دەوترێی زەکات نادەی ؟ ئادەی بزانین چەند مالت هەیە ؟! ئەلێ ١٠ دەفتەر دەی پێنجی جیاکەرەوە ئەوە غەرامەکەیەتی پاشان زەکاتەکەشت بدە لەمالەکەت بێ ئەدەبی واش نەکەی جارێکیتر زەکاتەکەت نەدەی ئەوە سزاکەیەتی !!.بۆیە زانایان دەلێن : بەتاك کافر نابێ سزاکەی ئەوەیە نیوەی مالەکەی مسادەرە ئەکرێی چەندی هەتبوو نیوەی جیابکەرەوە پاشان زەکاتەکەش ئەدەی بەلوت شکاوی وە تەوبەش بکە بۆلای الله تعالی بەم شێوەیەیە .

## بەشی سێیەم :

بریتیە لە چیرۆکەکانی ئیمانداران و کافران لەقورئان هەمووی سەرانسەری تۆ سەیری بکەی چیرۆکی ئیمانداران و کافران باس دەکا الله تعالی چیرۆکی سەرۆکی ئیمانداران پێغەمبەری پێشەوامان (صلى الله عليه وسلم) باس دەکا لەقورئاندا بڕۆن بیخوێنەوە لەقورئاندا بزانە چۆن باسی پێغەمبەرمان دەکا (عليه الصلاة والسلام) چۆن داوای لێ دەکا کەچی بکا لەدونیادا حالی چۆن بووە و لەقیامەتدا حالی چۆنە !

هەروەها باسی کافرانمان بۆ دەکا سەیریان بکەن بزانە فیرعەونەکان لەقورئاندا کە الله تعالی باسیان دەکا حالی یان چۆن بووە و چۆن بەزەلیلی ڕۆیشتوون ئەوەش سزا و عقوبەی کافرانە .

لەبەر ئەوە ئێوە سەیری چیرۆکەکانی قورئان بکەن چ لەئاستی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) چ لەئاستی پیاوچاکان ئەوانەی کەوا خیلاف هەیە لەنێو زانایان کەوا پێغەمبەرن یاخود نا ، وەکو (ذوالقرنین و لوقمان )وەکو ئەو پیاوەی کە لەسورەتی یاسین باس دەکرێی کە هات دیفاعی لە پێغەمبەرەکان کرد و کوشتیان (عليهم الصلاة والسلام) وەکو ئیمانداری ئالی فیرعون جا بەکورتی باسیان بکەین .

ذوالقرنێك جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان كە ئایا پێغەمبەر بووە یان نا گریمان پێغەمبەر نەبوە بەلأم بەتەئەكید مەلیكێكی گەورە بووە لەسەر ئەم زەمینەدا خوێندوتانە لەسورەتی (الكهف) الله تعالى دەفەرموی : (وَيَسْأَلُونَكَ عَن ذِي الْقَرْنَيْنِ)[٣٤] مەلیكێك بوو كەوا شەرق و غەرب دەگەرا بەدوای كەسێكدا بەرامبەر بە الله لوتی بەرزبێ تاوەكو لوتی بشكێنی و لوتی ئەشكاند ئەوەبوو مەلیك !! بەدوای بەرژەوەندی خۆیدا نەدەگەرا بەدوای كۆكردنەوەی گەنجینەدا نەدەگەرا بەدوای ئەوەندەگەرا كەوا خەلكەكە بچەوسێنیچتەوە وخەلك دوعای لێ بكا ! كێ ئەمرۆ رازییە لەسەر كردەكانی سەر زەمینە پێم بلێن كێ دوعایان بۆ دەكا بلێ یارەبی پارێزراوت بكا مادەم ئەم عەدالەت بلاو كردۆتەوە لەسەر ئەم زەمینەدا !! هەمووی نالانێنی !! هەموو خەم و خەفەتمان نیە !؟ كێ هەیە بێ خەم و خەفەت بێ ! إلا كەسانێك كە لەگەلیاندا بن و شەریكیان بن خوا خوایەتی كەوا ئەم شتە بروا ، بەلأم زۆرینەی زۆری خەلك حال و گوزەرانی چۆنە !؟

لەبەر ئەوە ئەگەر تۆ سەیری چیرۆكەكانی قورئان بكەی دوو شتت بۆ دروست دەبێ :

ئازایەتی و شەجاعەت لەحەق وتن هیچ كاتێك سل مەكەرەوە چونكە تۆ لەسەر ئەنجام ئەگەرێتەوە بۆلای الله تعالى یان سەر دەكەویی بەوتنی حەقەكەت یان شەهید دەكرێی ، هەردووكیان بۆتۆ سەركەوتنە ، بەلأم ئەی ئەگەر حەقت نەوت چیرۆكەكانی قورئان وا فێری مامۆستایانی ئاینی دەكەن لەسەر حەق یەك كات و سات دوا نەكەون چونكە ئەگەر هاتو دواكەوتن ئەو خەلكە بەبێ دین و ئیمان ئەروا پەنا ئەگرین بە الله لێی تێك دەچێ وەكو ئەمرۆ ، چیرۆكەكانی قورئان ئەوەمان فێر ئەكەن كە وتنی حەق یان نەوتنی لە ئەجەلی تۆ كەم و پێش ناكا ، یانی ئەگەر من حەق بلێم یان نەیلێم ئەجەلەكەم دێتە دواوە و دێتە پێش؟! الله تعالى دەفەرمووی : (وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُّؤَجَّلًا)[٣٥] وە هەروەها دەفەرمووی: (وَلَن يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا ۚ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ)[٣٦] سەیری ئایەتەكە بكەن چەند ترسناكە (خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ) وریابە ئەوەی الله تعالى بۆی داناوی هەر

[٣٤] :سورة الكهف اية : ٢٣
[٣٥] :سورة ال عمران اية : ١٤٥
[٣٦] سورة المنافقون اية : ١١

ئەوەیە حەق بلێت و نەیلێت هەر ئەوەیە کە الله تعالی بۆیی داناویی ئەبێ لەفلان دەقیق و سەعات و سانیە بمریت ! !

ئینجا حەق بلێت باشترە یاخود خۆت بشاریتەوە لەحەق ! ؟ چیرۆکەکانی قورئان ئاوامان فێر ئەکا نەك دابنیشیت و بلێت بەخوا چیرۆکێکی خۆشی باس کرد مامۆستا ! ! ئیتر برۆیتە دەرەوە تەواو ! نەخێر بەڵکو فێربە لێی ئەوە ذو القرنین .

لوقمان خیلاف و جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان ئایا پێغەمبەر بووە یاخود پێغەمبەر نەبووە ، هەرکامێکیان بێ ئامۆژگاریی کورێکی ئەکا چی پێ ئەلێ ؟!

لەپێش هەموو شتێکەوە پێی ئەلێ : (يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ ۖ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ)[٣٧] بەمناله جوانەکەی دەلێی: کورە جوانەکەم شەریك بۆ خوا قەرار مەدە ، لەغەیری الله زیاتر مەپەرستە هیچ رێباز و رێگایەك لەغەیری رێباز و رێگای الله هەلمەبژێرە تەنها لەگەل رێبازەکەی الله تعالی دا برۆ ، هەر لەمنداڵیەوە باوکی فێری ئەکات لەمنداڵیەوە فێری ئەکا کەوا عابد بێت بۆ الله تعالی عابید نەبێ بۆکەسانی تر .

ئێمە منداڵەکانمان لەمنداڵیەوە فێریان ئەکەین بزانین چیان فێر ئەکەین ؟!

کێ مان منداڵەکەمان بەیانیان خەبەر کردەوە تەمەن حەوت ساڵان کە لەوێوە نوێژی لێی داوا کراوە پێی بلێی رۆڵە هەلسە بانگی دا ، کەچی ئێمە دەلێن : نا لێ گەری سەرمای ئەبێ و خەوی دێی گوناهە ! ئەی بۆ مەکتەبەکەی ! ؟ هەلسە دەی خێرا بەشەق لێی دەدا تاوەکو بۆ مەکتەبەکەی بروا بۆ ؟ مەکتەبەکەشی بۆ عیلم نیە ، ئەلێ موستقبەلی دەفەوتێی پارەکەی دەفەوتێی ، دەبا بەهەمووتان بوترێی منداڵان موستقەل و پارە و راتبی نیە ئەیان نێرن بۆ مەکتەب ؟! ئەو کات ئەلێن مەکتەبم بۆ چیە برۆ خێر عەمەلاتیەك بکە یاخود خۆت فێری میهنەیەك بکە باشترە یا موستەقبەلت نەروا کێ بۆ عیلم منداڵی ئەنێرێتە مەکتەب ،

[٣٧] : سورة لقمان اية : ١٣

نەباوەركە بەس بۆ پارەیە ، كەواتە بۆ پارە مندالەكەت هەلساند ! بەس بۆ الله هەلت نەستاند بۆ پارە لێی ئەدەی و رەحمی پێی ناكەی بەس بۆ خوا ئەلێی موشكیلە نیە با بخەوێی گوناهە !! خواموشكیلە نیە !!

ئا لێرەدا كێشەكە زۆر گەورەیە تۆ بروات بە رسقی خواش نەبوو ! باشە راتب رسقی ئێمە ئەدا؟! تخوا ئێستا كێ بەراتب خۆی ژیاندوە بەس پێم بلێن ؟! بەراتبی هەموو حوكماتی ئەم سەر زەمینە كێ بەراتب ئەروا بەرێوە یەكێك بلێ من بەراتب خاونم كرد و سەیارەم كری و ژنم هێنا و و ژنم بۆ مندال هێنا و پێویستیەكانی ژیانم تەواو كرد كێ تان كردویەتی !؟ بەشیشتان ناكات إلا ئەبێ لەلایەكیترەوە الله تعالی رەحمت پێی بكا كەچی تۆ متمانەت بەم خوایە نیە ئەلێ : نا من راتب من ئەژێنی ، بەس زەكاتەكەی الله داناوە بەشی هەموو دونیا ئەكا ئەگەر بەراستی بدرێی كەچەندێك خەلك بەو دلە پر لەئیمانە ئەیهێنی و ئەیدات بە فەقیر و هەژاران و بەبێ منەت ! ئەلێ ئەوە حەقی خوایە ، بزانە الله تعالی چەند بەرەحمە بۆتۆ !!وایە یان وانیە ؟!

ئەمە سێ بەشەكەی قورئان ، ئینجا قورئان ئاوا تێبگەن خۆشەویستانم ، خەم و خەفەتت دەبێ ئەلێ : ئادەی جگەرەیەكم بدێی ئەلێ : ئەوەچیە كاكە ؟ ئەلێ : والله خەفەتم هەیە !! لەم رۆژانەدا گەنجێكی جوان هاتوە خەفەتی هەیە چووە و داوای كچێكی كردوە و نەیانداوەتێ چۆتە نادی و خواردویەتەوە و بەسەر خۆشی هاتۆتەوە و برایەك هێنای تاوەكو ئامۆژگاری بكەین ! ئەلێن : ئەوە چیە ئەلێ : والله خەفەتم هەبوو !!

كاتێك كە خەفەتمان هەبوو چی بكەین خۆشەویستانم ؟!خەفەت بەچی ئەروا ؟ غەم و پەژارە بەچی ئەروا ؟

حەدیثێك ئەهێنین ی : (ینبغي لنا أن نتعلم) هەر كەسێك گوێی لەم حەدیسە بوو فەرزە لەسەری ئەبێ فێری بێت نابێ و ناكرێی ئێستا باسی ئەكەین بۆیە ئەبێ حەدیسەكە فێر بن ئەبێ كەلیماتەكانی لەبەر بكەن بیكەن بەدوعا لەهەموو خەفەتەكانتاندا بیلێن !.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی : هەرکەسێك گوێی لیٚ بێت ئەبیٚ لەبەری بکا وە ئەبیٚ بیلێت ئەبیٚ ئەو کەلیماتانە بلێتەوە بۆ ئەوەی ئەو خەم و خەفەتەی کەهەیەتی بروا بەمەش ئەورا کە ئێستا باسی کردوە .

دەقەی حەدیثەکە ئەخوێنینەوە لەمسندی ئیمام ئەحمەد بە سەنەدی صەحیح هاتووە هەروەها لەصەحیحی إبن حبانیش هاتوە لەعبداللە کوری مسعودەوە(رەزا ورەحمەتی الله تعالى یان لیٚ بێت)( قال رسول الله صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەر (ًصلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (ما قال عبد قط إذا أصابه هم أو حزن)هیچ بەندەیەك نیە لە موسلمانان کە ئەگەر تووشی خەم و خەفەتێك ببیٚ إلا ئەم شتانە بلێی کە ئێًستا ئەیلێی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەمە وتەکەیە : (اللهم إني عبدك ابن عبدك ابن أمتك ناصيتي بيدك)یا الله ئەی پەرستراوی من من بەندەی تۆم کوری بەندەی تۆم کوری کەنیزەکی تۆم واتا دایك و باوکمان عەبد و بەندە و کەنیزەکی خوان خۆشمان عەبدی خواین (ناصيتي بيدك)نێو چاوانم بەدەستی تۆیە یا الله (ماض في حكمك)ئەوەی زانیوتە لەحەقی مندا لەعیلمی غەیبی خۆتدا کەبەسەرمن دێت ئەبیٚ هەر ئەوە بیٚ واتا ئیمانم بە قەزا و قەدەری تۆ هەیە ئەی خوایە ئەوەی بۆت نوسیم هەر ئەوەیە (عدل في قضاؤك) ئەوەی لەسەر منت نوسیوە و عەدلە و هیچ زولمێکی تێدا نیە چیم بەسەردیٚ هەمووی عەدالەتی خۆتە واتا من لەنێوان عەدالەت و فەزلی تۆدا ئەژیم ئەی الله تعالى ئەگەر شتێکت دامی و پێی بەختەوەر بووم ئەوە فەزلی خۆتە ئەگەر تووشی موصیبەتێك بووم ئەوە عەدالەتی خۆتە و زولمت لەمن نەکردوە (أسألك بكل اسم هو لك) داوا لەتۆ ئەکەم بەهەموو ناوێك کە بۆخۆتت داناوە خوای تبارك وتعالى ئی تۆیە (سميت به نفسك) کە بۆخۆتت داناوە (أو أنزلته في كتابك)یان لەقورئانەکەتدا تێدایە ، وتمان بەشی سێیەم لەبەشی یەکخوا پەرستی ناسینی الله تعالى یە بە ئەسما وصیفاتەکانی (أو علمته أحدا من خلقك)یان فێری یەکێك لە خەلقەکەی خۆتت کردوە لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) (أو استأثرت به في علم الغيب عندك)یان فێری کەست نەکردوە لەعیلمی غەیبی خۆتدا داتناوە بەکەست نەوتوە ئەمەش دەلیلە لەسەر ئەوەی کەوا الله تعالى ناو و سیفاتی بیٚ کۆتایی هەیە زۆر کەس هەیە دەلیٚ الله تعالى ٩٩ ناوی هەیە و بەس نا ئەو حەدیسە بەهەلە تێگەیشتوون

حەدیسەکە دەڵێ : ئەگەر تۆ ٩٩ ناوی خوا بژمێریی لەنێوان ئەو هەموو ناوانەی کە کەس نازانی چەندە ! ئەوە الله تعالی ئەیخاتە بەهەشت ، بەمەرجێك ئیشی پێی بکا و تێبگا و بەوناوانە کار بکات ،

کەواتە ناو هەیە الله تعالی لای خۆی دایناوە هەتاوەکو بە پێغەمبەریشی نەوتوە (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەش یەکێك لەگەورەترین بەلگەکان کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) غەیب نازانی، پێغەمبەر عیلمی لەوح وقەلەمی نیە ! پێغەمبەر بەشەرێك الله تعالی دەفەرموویێ : ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾[٣٨] من بەشەرێکم وەحیم بۆ دێی ئەوەی بۆم بێی هەر ئەوەندەیە ئەوەشی بۆم نێت نایزانم ، باشترین بەلگەش ئەوەیە پێغەمبەر ئەیزانی کەوا کەی قیامەت دێی ؟! هەمووتان ئەزانن کە جوبریل لێی پرسی رۆژی قیامەت کەیە ؟ فەرمووی : منیش و جوبریل نایزانی کەیە، کەواتە الله تعالی لە لای خۆیی شاردویتیەوە .

(أن تجعل القرآن)دوای ئەوەی بەم شێوازە جوانە داوات کرد پێغەمبەر نەهات (صلی الله علیه وسلم) بلێ خوایە بۆ خاتری پیاو چاکان و خوایە بۆخاتری فلان یان بلێ خوایە بۆ خاتری دار و بەرد !! نەخێر بزانە بەچی داوا دەکا بەناوەکانی الله تعالی بەزاتی الله تعالی داوائەکا (أن تجعل القرآن ربیع قلبي)تۆ قورئان بکەیت بە بەهاری دلم ،یانی دلم بەوە بگەشێتەوە بەم قورئانە ، کەچی ئێی ئێستا دەڵێ نەخێر براکەم بەجگەرە دلی ئەگەشێتەوە برا موسلمانەکەم بەپێکی عارەق دلی ئەگەشێتەوە ! برا موسلمانەکەم کەکاتێك دلی بێتاقەت و خەفەت بار ئەبێ ئەچێتە ئەو بازارە و پیاسەیەك ئەکا و چاوی لەچوار ئافرەت بکەوێی دلی ئەگەشێتەوە ! ئەلێ : با بچم خەمێك بەبا بدەم تاقەتم نیە لەمالەوە دانیشم خەمەکەی بەچی بە بادەدا بەنەزەر کردن ؟!!

نەخێر بەلکو بەقورئانەکەی خوا قورئانەکە بکە بەهاری دلت بەهاریش بەخۆتان ئەزانن ئەنواع و ئەشکال گولی تێدایە وە ئەنواع و ئەشکال سورەت و ئایەتمان هەیە دلتی پێی برازێنەوە ،

---

[٣٨] سورة الکهف اية : ١١٠

پاشان دەفەرموویی : (ونور بصري)بیکەی بە ڕۆشنایی سنگم ئەی خوایە (وجلاء حزني)بیکەی بەلابەری خەفەتەکانم ، سەیری بکە خەفەت لەشتی ڕابردوو ئەخورێی ، ئەلێ واللە خەفەتم هەیە !! فلان شت ڕوویداوە خەفەتم هەیە و خەفەت ئەخۆم ! یانی لەشتی ڕابردووەکان تۆ خەفەتت هەیە (وذهاب همي) لابردنی خەم (هم)خەمە ،خەم ئەوەیە کە ئێستا شتەکە ڕوویداوە ئێستا حالێن تۆ ئەلێ بەخوا ئەو خەمەم هەیە ، خەفەت بۆ ڕابردووە بەلام هەم و خەم بۆ ئێستایە ،

شتێکیترمان هەیە سەیری کەلیمەی هەم و لەگەل غەم !

زانایان دەفەرموون : (وإن كان يتعلق بواقعِ الإنسان وحاضره فهو غم .)[39] غەم لەزمانی کوردی خۆماندا ناوبراوە بە خەم ، خەم بۆ ئێستایە ، هەمان هەیە کە لەحەدیسەکەدا باسی کردوە بۆ داهاتووە ، یانی ئێمە ئێستا سێ شت لەبەردەستماندا هەیە ، ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو .

ڕابردوو: تۆ خەفەتی لێ دەخۆی هەمووتان خەفەت لەڕابردووتان دەخۆن لەکەم و کوری و گوناهەکانتان.

داهاتوو : لەداهاتوودا تۆ ئەترسی خەوفت هەیە ئەلێ ئەبێ چیم بەسەر بێ .

ئێستاش : خەمی ئەوکاتەت هەیە .

ئەگەر تۆ بێت ئا ئەمە بلێت هەر سێ شتەکەت نامێنی ، بۆ ؟ چونکە تۆ قورئان دەکەیتە سەر مەشقی خۆت تۆ قورئان دەکەیت بە ڕابەری خۆت بەهیچ شێوازێك تۆ ویل نابی لەودونیایەدا .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی :(إلا أذهب الله همه وأبدله مكان حزنه فرحا)[40] إلا خوای تبارك وتعالى خەم و خەفەتەکەی لادەبا وە جێگەکەی دەکات بە دلخۆشی .

لەم حەدیثەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چوار ئەصلی تێدایە بابەوردی سەیری ئەم چوار ئەصلە بکەین :

---

[39] : أثر الأذكار الشرعية: (ص/٤)
[40] : في صحيح ابن حبّان " ٩٧٢ "

ئەصلی یەکەم : تەحقیقی عیبادەتە :

تۆ ئەڵێ : ((للهم إني عبدك) ئیعتراف دەکەی تۆ لێرەدا دەڵێت : ئەی خوایە من عەبد و بەندەی تۆم (ابن عبدك) باوکیشم بەندە و عەبدی تۆیە (ابن أمتك)دایکیشم هەر کەنیزەکی تۆیە ، کەواتە لێرەدا تۆ ئیعترافت کرد کەتۆ ئی خوایی ، تۆ ئی خۆت نیت چ جای ئی کەسێکیتر بیت تۆ بۆخۆت هەوا و ئارەزوی خۆت ناپەرستی چ جای هەوا و ئارەزووی کەسێکیتر بپەرستی تۆ ، تۆ ئەڵێ من عەبدایەتی بۆ الله دەکەم کەواتە ئەمە ئیعتراف بوو بە بەندایەتی ئەبی بەم شێوەیە بیر لەحەدیسەکە بکەینەوە .

ئەصلی دووەم : ئیمان هەبوون بە قەزا و قەدەر :

تۆ ئەڵێ : (ناصيتي بيدك ماض في حكمك)ئەمە قەزا و قەدەرە ، خوایە من لەسەر ئەو نەخشەیە دەرۆم کە تۆ دات ناوە ، تەبعەن ئاگادارین پێش ئەوەی مخلوق دروست بێ الله تعالی هەموو شتێکی زانیوە ئەزانی ناوت چیە و کوری کێ ی وە ئەزانی بەهەشتیت یاخود جەهەنەمی وە ئەزانی باش دەکەی یاخود خراپ وە ئەزانی ئاخیر لوقمە کامەیە کە تۆئەیخۆیت ! وە ئەزانی هەموو گەلاکانی سەر زەمین لەکەیدا ئەباری و کەی دەباری و ژمارەیان چەندە و چەند نیە ، تۆ چەند بیری لێ بکەیتەوە زۆر زەحمەتە ئەبێ بترسی لەبەردەمی ئەو خوایەدا ، ئەوە قەدەری الله تعالی یە ، تۆلێرەدا ئەڵێ خوایە من ئیعتراف بە قەزا و قەدەری تۆدەکەم .

جا لێرەدا زۆر کەس ئیشکالی بۆ دروست دەبێ ئەڵێ : باشە کە خوا ئەوەی لەسەر من نوسیوە من گوناهم چیە ؟

ئەمە زۆربەی شیوعی و لینینی و مارکسیی و بێباوەرەکان و لەکاتی خۆشیدا کافرەکان ئەمانەیان هێناوە یاخود کەسانێك هەبوون پرسیاریان کردوە نەك لەروانگەی ئینکارییەوە بەلکو لەروانگەی زانینەوە ئەیانویست بزانن ، صەحابە بە پێغەمبەری ویت (صلى الله عليه وسلم) کە خوا نوسیویەتی ئێمە بۆ عەمەل بکەین ؟ ئەمە لەوانگەی ئینکارییەوە نەبوو باش بزانن بەلکو بۆ زانینیان بوو و ئەیان پرسی ئەویانویست بزانن تۆش بەدلتدا دێت مەرج نیە

هەرکەسێك ئەم قسەی کرد بلێن تۆ کافری بەڵام هەیە بەکوفرەوە ئەیکا یانی ئەچیٚ زینا و قەتل ئەکا کە پیٚ دەلیٚ بۆ وا دەکەی دەلیٚ لێم گەرێن خوا لەسەری نوسیومە نالێن خوا هەیە و هەموو شتێکی زانیوە ئەوە لەسەری نوسیومە و دەکەم ! !

ئێمە رەدمان بۆ ئەوانە ئەوەیە دەلێن : دەنوێژیش بکە و بلیٚ خوا لەسەری نوسیوم ! ! دەدەرگای مالەکەت بکەرەوە با بێن و قاسە دۆلارەکەت بدزێی بلیٚ بەخوا خوا لەسەری نوسیوم با ئەو دزە بیبات و قسە ناکەم ! ! دەبا ژن و مندالت فەساد بکەن و بلیٚ خوا نوسیویەتی و من قسە ناکەم ! ! ئەی بۆ بۆوە قسە دەکەی ! ! ئەی ئەوەش هەر خوا نەینوسیوە ! ؟ بەس تۆ نازانی خوا چی نوسیوە ئەبیٚ ئاگادار بی الله تعالی بەدرۆیان ئەخاتەوە ! راستە الله تعالی هەموو شتێکی زانیوە بەس تۆ لەکوێی زانیوەتە الله ئەوەی نوسیوە ! ؟ لە مەسەلەی قەزا و قەدەر کێشە زۆرە ئەبی ئاگادار بین وردبین لەسەری .

الله تعالی هەموو شتێکی زانیوە و وە زانیویەتی تۆ چی دەکەی و چی ناکەیت جالەم حەدیسەدا بۆیە دەلیٚ ئەی خوای تعالی تۆ هەرچیەك دەکەیت تۆ حەکەمی عەدلی .

ئەصلی سێی یەم :داوا کردن بە ئەسمط الحسنى :

تۆ دەلیٚ : (أسألك بكل اسم هو لك)بەهەموو ناوەکانی تۆ داوا دەکەم نەهاتی بلیٚ بەناو پێغەمبەرم و ئادەم و نوح و هەموو قورئان بگەریی ئەمەی تێدا نیە ، ئێستا لەوانەیە کەسێك بلیٚ یانی ناکرێی بلێم بۆخاتری پێغەمبەر ؟! ئەلێن ئەگەر جائیز بووایە خوای تعالی دەیفەرموو ئەی وت (وللرسول الاسمط الحسنى فدعوه بها )بەس نەیوتوە (للرسول)وتویەتی : (وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا ۖ)[41] من نازانم بۆ ئەم خەلکە ئەوەندە دووژمنی خوان کە پێیان ئەلیٚ : بەس خوا ئەلیٚ نا خوا و پێغەمبەر و صەحابە و فلان و فلان ! ئاخر نابیٚ بیپەرستی لە الله زیاتر نابیٚ پێغەمبەریش بپەرستی لە الله زیاتر (صلى الله عليه وسلم) عیبادەت ئەمەیە بۆ خوایە بەتەنها (وحده لا شريك له)تۆ ناچی بۆ حەج و عومەرە ئەلێت : (لبيك اللهم لبيك)خۆ نالێت (لبيك يا رسول الله ! !)وا نالێت !

---

[41] : سورة الأعراف اية : ١٨٠

بەلكو ئەلێت : (لبيك اللهم لبيك .. لبيك لا شريك لك لبيك .. إن الحمد والنعمة لك والملك لا شريك لك) شەريك كێی يە؟ هاوبەشە ! نەخێر الله تعالى هاوبەشی نيە ، کەواتە هاوبەشی بۆ زياد مەکەن .

لێرەدا لەدوعاكەدا ئەلیٚ بەناوەكانی تۆ داوا ئەكەين .

الله تعالى ناوی زۆرن و نازانی ژمارەيان چەندە و بیٚ پايانە الله تعالى بەس ٩٩ ناوی نيە وەکو وتمان حەديسەکە صەحيحە کە دەلیٚ ٩٩ ناو بژمێرە بەلاٚم پێت ئەلیٚ : لەنێوان ناوەكانی الله تعالى کە کەس نازانی چەندە هەرکەس ٩٩ ناو کە بەصەحيحی هاتبیٚ لەقورئان و سونە هاتبیٚ .

ئەگەر ئێمە سەيری قورئان و سونەی صەحيح بکەين لە ٩٩ زياتريش هاتووە !! بەس تۆ ٩٩ ئەژمێريی کە ئيتفاقی لەسەر بیٚ لەقورئان و لە سونەی صەحيح وە ماناکانی بزانە وە ان شاء الله الله تعالى بەئيزنی خۆی ئەتخاتە بەهەشتەکەيەوە بەمەرجێکيش ئيش بەم ناوانە بکەيت ! شەيطانيش ئەيزانی بەس ئيشی پێی نەکرد شەيطان ئەيزانی يەك لەناوەکانی الله تعالى (ئيلاه)ە بەس ئيشی پێی نەکرد وتی : نا من سەجدە بۆ ئادەم نابەم ! تەواو ئيتر برۆ بۆ جەهەنەم با هەزار جاريش بزانی الله (ئيلاه)ە ، هيچ سودت پێی ناگەيەنێی ، مەرجی ئەمە ئەوەيە کەوا بەقسەی بکەيت .

ئەصلی چوارەم : عينايە بە قورئانی پيرۆز :

هۆکارەکەمان ئەمەيە کەوتی قورئان بکەيت بەچی ؟ (أن تجعل القرآن ربيع قلبي)بەبەهاری دلم ، ئەم قورئانە پيرۆزەمان لادواە ، ژيانمان بوە بەخەم و خەفەت ! پشتمان کردۆتە ئەم قورئانە پيرۆزە وەکو يەهود و نەصارا چۆن تەورات و ئينجيلايان فرێيدا (فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ)[٤٢] خستيانە پيشتی خۆيان رێبازيتريان خستە پێش خۆيان ،

[٤٢] : سورة ال عمران اية : ١٨٧

وەكو ئێستا دەڵێن : ئەم قورئانە لابە ئێستا كاتی ئەمە نیە! ئەوە كاتی ئەمە نیە ئەمە ئی عەرەبە پیًی پەتیەكان بوو ئەوە ئیی ئێمە نیە ئێستا ، ئێستا پێشكەوتن و مەدەنیەت و تەكنەلۆجیامان هەیە قورئان و خوا وپێغەمبەر و بەهەشتمان بۆ چیە ئێمە !! بەم شێوەیە بابەتەكە .

جا لەحەدیثەكەدا پێمان دەڵێ بلێ : قورئان بكەیت بە بەهاری دلم خەم و خەفتەكانمی پی لابەی خوای تعالی ، ئەڵێ إلا خوای تعالی خەم و خەفەتەكانی لادەبا.

وەهەر كەسێكیش ئەم حەدیثەی بیست جارێكیتر باسی دەكەمەوە ئەڵێ : پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : كە ئەمەی وت : إلا ئەو كەسە خەم و خەفەتی نامێنی بەمەرجێك بەم چوار شێوەیەی باسمان كرد هەمووی وەربگرێی ، نەك تۆ بلێ قورئان بكە بەبەهاری دلم و برۆیت و رێبازێكیتر بكەیت بەبەهاری دلت خۆشیت بە قورئان نێت و خۆشیت بەغەیری قورئان بێ ئەمە بەهۆیەوە خەم و خەفەتت زیاتر دەبێ بەم شێوەیە كەم نابێتەوە بەلكو زیاتر دەبێ .

(قالوا : یا رسول الله ینبغي لنا أن نتعلم هذه الكلمات ؟) وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پێویستە لەسەرمان ئەم كەلیمانە فێر بین ؟ (قال : ( أجل ینبغي لمن سمعهن أن یتعلمهن ) پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : بەلێ هەر كەسێك گوێی لێ بوو دەبێ بیلێت .

جا ئەمە دوعای حزنە لەناو كیتابەكاندا مەوجودە لەناو حسن المسلم و لەناو چەندەها كیتابدا إن شاء الله هەركاتێك كە خەم و خەفەتت هەبوو بیخوێنە والله بەبێ ریا و سومەعە دەیلێم والله العظیم چەند جارم خوێندۆتەوە الله تعالی خەم و خەفەتی لابردووم ئابەم شێوەیەی كە باسمان كرد بەلأم .

داوا دەكەم لە الله تعالی یارمەتی دەری هەموو لایەك بێ .

حەدیثێك باس دەكەین لە حەدیثەكانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەصەحیحی بوخاری لەباب تعبیری الرویا لەدوای نوێژی بەیانی .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)عادەتی وا بوو لەدوای نوێژی بەیانی دائەنیشت نەئەخەوتەوە لەگەل صەحابە و هاورێكانی رووی تیَ ئەكردن و پێی دەوتن : كیَ لە ئێوە خەوێكی بینیوە !؟ با بۆی تەعبیر بكەم كیَ خەوێكی بینیوە با بۆی لێك بدەمەوە ، جا لەم بابەدا ئیمامی بوخاری (رحمه الله) حەد یثێكی درێژمان بۆ دەهێنی كە ئێمە مەبەستمان تێدا بریتیە لەوەی كەوا ئەگەركەسێك قورئان وەربگرێی و رەفزی بكاتەوە و عەمەل و ئیشی پێی نەكا و شەو نەیخوێنێتەوە و نوێژی بەیانی نەكا حوكمی ئەو كەسە چیە ؟! لەم حەدیثەدا حوكمەكە بەدیار دەكەوێی كەبەراستی عقوبەیەك و تۆلەیەكی زۆر ترسناكمان نیشان ئەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)كە لەو خەوەدا كە بەخۆی بینیویەتی باسی دەكا .

حەدیثەكە لە سەمورەی كوری جوندب (رەزا و رەحمەتی الله تعالى لیَ بیَ )دەفەرمووی : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)( كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِمَّا يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ لِأَصْحَابِهِ)بەزۆری ئەمەی بەهاورێكانی دەوت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)هەموو بەیانیەك رووی تێدەكردن و پێی دەوتن (هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنْ رُؤْيَا،) كەس لەئێوە خەوێكی بینیوە ؟! رووی تێدەكردن و هەر وای دەوت ، تەبعەن ئەمە لێرەدا ئیشارەتە بۆ عیلمی تەعبیر كە عیلمێكی زۆر گەورەیە لەناو ئێمەدا ئێستا زۆر بەدەگەمن ماوە لەبەر ئەوە قواعیدەكانی زۆربەی خەلكی نایزانی .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو : كەس لەئێوە خەوێكی بینیوە ؟ دەفەرمووی : (قَالَ: فَيَقُصُّ عَلَيْهِ مَنْ شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُصَّ،)سەیر كە صەحابە ئەهاتن بۆیان دەگێرایەوە من ئەو خەوەم بینیوە ئەویتر دەیوت من ئەو خەوەم بینیوە ، (وَإِنَّهُ قَالَ ذَاتَ غَدَاةٍ:) رۆژێكیان بەیانیەكیان لەبەیانیەكان پێی وتین كە بۆخۆم خەوم بینیوە با بۆتان بگێرمەوە ، ئەمە خەوەكەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم).

دەفەرمووی : (إِنَّهُ أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتِيَانِ، وَإِنَّهُمَا ابْتَعَثَانِي) ئەم شەو لەخەودا دوو پیاو هاتن و منیان هەلساند و لەخەوما لەگەل خۆیاندا منیان برد (وَإِنَّهُمَا قَالاَ لِي انْطَلِقْ)پێیان ئەوتم برۆ و پێشمان بکەوە با برۆین (وَإِنِّي انْطَلَقْتُ مَعَهُمَا) لەگەلیان رۆیشتم (وَإِنَّا أَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ مُضْطَجِعٍ)کە رۆیشتین سەیرم کرد پیاوێك پال کەوتوە (وَإِذَا آخَرُ قَائِمٌ عَلَيْهِ بِصَخْرَةٍ،)یەکێکیتر بەسەر سەریەوە وەستاوە بە پێوە تاشە بەردێکی گەورەی هەلگرتوە بەدەستیەوە (وَإِذَا هُوَ يَهْوِي بِالصَّخْرَةِ لِرَأْسِهِ فَيَثْلَغُ رَأْسَهُ)بەهەموو هێزی خۆی ئەم بەردە ئەم تاشە بەردە ئەکێشی بەسەری ئەم کەسەی کە پالّ کەوتوە !کە ئەکێشی بەسەریدا چی بەسەر دێی ؟! (فَيَثْلَغُ رَأْسَهُ)ورد و درشتی دەکا و سەری پارچە پارچە دەکا و مۆخی سەری دەرئەچێتە دەرەوە و خوێن و گۆشتی هەر هەموو لەوناوەدا بلاو دەبێتەوە (فَيَتَدَهْدَهُ الحَجَرُ هَا هُنَا،)ئەو بەردە کاتێك ئەکێشی بەسەریدا ئەروا غلۆر دەبێتەوە و ئەروا بۆ ئەو سەری ئەوسەر (فَيَتْبَعُ الحَجَرَ فَيَأْخُذُهُ، فَلاَ يَرْجِعُ إِلَيْهِ حَتَّى يَصِحَّ رَأْسُهُ كَمَا كَانَ) کابرا دەروا بەردەکە دەهێنێتەوە لەسەری دا ئەوەستێی هەتا سەری چاك دەبێتەوە دیسانەوە پای دەکێشێتەوە بەبەردەوام ئاوای لێدەکا (ثُمَّ يَعُودُ عَلَيْهِ فَيَفْعَلُ بِهِ مِثْلَ مَا فَعَلَ المَرَّةَ الأُولَى،)جاری یەکەم چی لێکرد جاری دووەم و سێی یەم و دەیەم و چەندەهایتر هەر ئاوای لیّ دەکا ئەم کەسە کەوتوە ئەمیش بەتاشە بەرد ئەکێشی بەسەریدا سەری پان و پرش و پارچە پارچە دەبیّ خوێن و گۆشتی لیّ دێتە دەرەوە بەردەکە ئەروا و ئەچیّ بەردەکە ئەهێنێتەوە سەری چاك دەبێتەوە دیسانەوە وای لێدەکەنەوە ! بەردەوام لەو سزایەدایە الله تعالی پەنامان بدا یارەبی ! !

(قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: سُبْحَانَ اللَّهِ مَا هَذَانِ؟)پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زۆر سەرسام دەبیّ ئەلیّ : پاکی بۆ الله لەشەریك ئائەمە چیە پێم بلێن ئەمە چیە ئەم دوانە !؟ حالی ئەم دوانە چیە بۆ ئەمە وا لەمە دەکا ؟!

ئەفەرمووی : دوو کەسەکە پێیان وتم : (قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقِ انْطَلِقْ، قَالَ: فَانْطَلَقْنَا)برۆ برۆ ، جاری لیّ گەرێی شتیتر ماوە ببینی دواتر بۆت باس دەکەین .

(فَأَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ مُسْتَلْقٍ لِقَفَاهُ)هاتين و سەيرمان كرد كەسێك كەوتوە لەسەر پشت (إِذَا آخَرُ قَائِمٌ عَلَيْهِ بِكَلُّوبٍ مِنْ حَدِيدٍ،) كەسێكيش لەسەرى وەستاوە قولابێكى ئاسنينى پێى يە (وَإِذَا هُوَ يَأْتِي أَحَدَ شِقَّيْ وَجْهِهِ فَيُشَرْشِرُ شِدْقَهُ إِلَى قَفَاهُ، وَمَنْخِرَهُ إِلَى قَفَاهُ)ئەم كابرايەى كە قولابەكەى پێى يە دەيكا بەم كەسە هەلى ئەدرێى هەتا سەريى ئەيكا بەلوتيدا و هەلى ئەدرێى هەتا ئەو سەريى دواتريش دەلێ : (وَعَيْنَهُ إِلَى قَفَاهُ،)ئەيكا بەچاويدا هەلى ئەدرێى هەتا ئەوسەر ، واتا دەم و لوت و چاوى لەم سەرەوە بۆ ئەوسەرەوە هەل ئەدرێى ، دواتر ئەچێتە سەرى ئەو سەر ئەوانيتريش وا لىَ دەكا ، يەك لەراوى حەديسەكان ئەلىَ شەقى ئەكرد هەمووى دا ئەدريى بۆ سەرەوە (، ثُمَّ يَتَحَوَّلُ إِلَى الجَانِبِ الآخَرِ)ئەچو بۆلا كەيتريش واى لىَ ئەكرد (الآخَرِ فَيَفْعَلُ بِهِ مِثْلَ مَا فَعَلَ بِالْجَانِبِ الأَوَّلِ،)ئەوەى يەكەمى چى لێكرد ئەويش هەروا لىَ دەكا (فَمَا يَفْرُغُ مِنْ ذَلِكَ الجَانِبِ حَتَّى يَصِحَّ ذَلِكَ الجَانِبُ كَمَا كَانَ)لێرە تەواو نەدەبوو كە ئەچوو بۆ ئەولا كە ئەولاى هەلئەدرێى ئەولايتر چاك ئەبوويەوە لايەكيترى وا لىَ ئەكرد لايەكيتر چاك دەبوويەوە هەر بەم شێوازە ئەمى هەل ئەدرێى ئەچوو بۆلاكەيتر ئەمى هەل ئەدرێى لايەكيتر چاك دەبوويەوە هەروا بەردەوام دەبوو بەبەردەوام خەريكى هەل درێنى لوت و چاوى و دەمى ئەم كەسە بوو بەقولابى ئاسنين !

(ثُمَّ يَعُودُ عَلَيْهِ فَيَفْعَلُ مِثْلَ مَا فَعَلَ المَرَّةَ الأُولَى،)دواتر وەكو خۆى دەگەرايەوە سەرى چى لەم لا كرد بەهەمان شێوەش واى لەلايەكەيتريش ئەكرد ! ! !

(قَالَ: قُلْتُ: سُبْحَانَ اللَّهِ، مَا هَذَانِ؟)پێغەمبەر فەرمووى (صلى الله عليه وسلم) پيم وتن : سبحان الله ، ئەمە بۆ شتێك دەوترێى كە تۆ سەرسام بى لەو ئيشەدا كە ئەبينى ، پاكى بۆ الله لە شەريك و پاكى بۆ الله لە زولم و پاكى بۆ الله لە نوقصانى ئەمە چيە ؟ ئەمە بۆ حاليان وايە ؟ !

(قَالَ: قَالاَ لِي) هەردووكيان پێيان وتم (انْطَلِقِ انْطَلِقْ) برۆ برۆ ، برۆ باشتيتر ببينى ، ئەمە تەبعەن هەر شت ئەبينى و پێى نالێن ئەمە چيە لەدوايدا هەموو شتەكانى بۆ باس دەكەن جارى با بزانين چى تريشى بەسەردا هاتووە !.

(فَانْطَلَقْنَا، فَأَتَيْنَا عَلَى مِثْلِ التَّنُّورِ –)ڕۆیشتین و سەیرمان کرد شوێنێك وەك تەنور وابوو سەرەکەی تەسك بوو و ناوەکەشی زۆر فراوان بوو (قَالَ: فَأَحْسِبُ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ – فَإِذَا فِيهِ لَغَطٌ وَأَصْوَاتٌ،)دەفەرمووی : لەناو تەنورەکەدا دەنگە دەنگ و هاواری و قیژەی تێدا بوو (قَالَ: فَاطَّلَعْنَا فِيهِ)دەفەرمووی : چوین سەیرمان کرد و سەرمان شۆر کردەوە (فَإِذَا فِيهِ رِجَالٌ وَنِسَاءٌ عُرَاةٌ، وَإِذَا هُمْ يَأْتِيهِمْ لَهَبٌ مِنْ أَسْفَلَ مِنْهُمْ)تەماشامان کرد پیاو وژنی روت و قوتی تێدا بوو لەبنەوە ئاگر بۆیان ئەهات ئەوانیش هاوار و قیژەیان ئەکرد (فَإِذَا أَتَاهُمْ ذَلِكَ اللَّهَبُ ضَوْضَوْا)ئەگەر ئاگر بۆیان بهاتایە قیژەیان ئەکرد و خۆیان ئەچەماندەوە !

(قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: مَا هَؤُلَاءِ؟)دەفەرمووی : پێم وتم : ئەمانە کێن ؟ (قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقِ انْطَلِقْ) برۆ برۆ جاری کاتی ماوە شتیتر ببینە .

(قَالَ: فَانْطَلَقْنَا، فَأَتَيْنَا عَلَى نَهَرٍ – حَسِبْتُ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ – أَحْمَرَ مِثْلِ الدَّمِ)دەفەرمووی : هاتین و ڕۆیشتین و سەیرمان کرد ڕووبارێکمان بینی ڕووبارەکە سور بوو وەکو خوێن وابوو ، (وَإِذَا فِي النَّهَرِ رَجُلٌ سَابِحٌ يَسْبَحُ)لەناو ئەو ڕووبارە سورەدا کابرایەکی مەلەوانی تێدابوو مەلەوانی دەکرد (وَإِذَا عَلَى شَطِّ النَّهَرِ رَجُلٌ قَدْ جَمَعَ عِنْدَهُ حِجَارَةً كَثِيرَةً)لەسەر ڕۆخی ڕووبارەکە لەسەر کەنارەکەی پیاوێك وەستابوو مەجموعەیەك وردە بەردی گەورەی لەبەر دەمیدا بوو (وَإِذَا ذَلِكَ السَّابِحُ يَسْبَحُ مَا يَسْبَحُ، ثُمَّ يَأْتِي ذَلِكَ الَّذِي قَدْ جَمَعَ عِنْدَهُ الحِجَارَةَ)مەلەی خۆی دەکرد لەناو ئەو ڕووبارە سورەدا و ئەهاتەوە بەردەمی کەسەکە کە لەکەنار ڕووبارەکەدا بوو کە ئەهاتە بەردەمی (فَيَفْغَرُ لَهُ فَاهُ)دەمی دەکردەوە کەدەمی دەکردەوە (فَيُلْقِمُهُ حَجَرًا)بەردێکی ئەخستە ناو دەمی (فَيَنْطَلِقُ يَسْبَحُ) کابرا بەبەردەکەوە ئەڕۆیشت و مەلەوانی ئەکردەوە (ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَيْهِ)ئەهاتەوە بۆلای (كُلَّمَا رَجَعَ إِلَيْهِ فَغَرَ لَهُ فَاهُ فَأَلْقَمَهُ حَجَرًا)هەر بگەرابایەوە بۆلای و دەمی ئەکردەوە و بەردێکی تێ ئەکرد بەبەردەوام خەریکی بەرد هاوێشتنە ناو دەمی ئەم کەسە بوو !!

(: قُلْتُ لَهُمَا: مَا هَذَانِ؟)دەفەرمووی : پێم وتن : ئەم دوانە چیە ؟ (قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقِ انْطَلِقْ،)دەفەرمووی : پێیان وتم : برۆ برۆ شتیتر ببینە جاری بۆت باس ناکەین .

(قَالَ: فَانْطَلَقْنَا، فَأَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ كَرِيهِ المَرْآةِ، كَأَكْرَهِ مَا أَنْتَ رَاءٍ رَجُلًا مَرْآةً)دەفەرمووی : سەیرمان کرد رۆیشتین و کابرایەکی هەتا بلێ ناشرینمان بینی چەند ناشرین بیَ ئابەم شێوازە ئاوا حیسابی بۆ بکە تا بلێ ناشرین (، وَإِذَا عِنْدَهُ نَارٌ يَحُشُّهَا وَيَسْعَى حَوْلَهَا،) ئاگرێکی لەلا بوو هەلی دەگیرساند وە لەدەوریدا ئەسورایەوە .!

(قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: مَا هَذَا؟)دەفەرمووی : پێم وتن : ئەمەچیە ؟ ئەم پیاو ئەم ئاگرە ؟! (قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقِ انْطَلِقْ،)دەفەرمووی : پێیان وتم : برۆ برۆ .

(فَانْطَلَقْنَا، فَأَتَيْنَا عَلَى رَوْضَةٍ مُعْتَمَّةٍ، فِيهَا مِنْ كُلِّ لَوْنِ الرَّبِيعِ)دەفەرمووی : رۆیشتین و سەیرمان کرد ئینجا باخ و بێستانێك وباخچەیەکی زۆر زۆر چر وپرمان بینی (مُعْتَمَّةٍ)بەمانای پریی بوو لە سەوزایی بەس سەوازیی رەشی ئەکردەوە ناو چەکە (فِيهَا مِنْ كُلِّ لَوْنِ الرَّبِيعِ)لەهەموو جۆرە گولێکی بەهاری تێدابوو ئەوەندە جوان بوو (وَإِذَا بَيْنَ ظَهْرَيِ الرَّوْضَةِ رَجُلٌ طَوِيلٌ)سەیرم کرد پیاوێکی زۆر بالا بەرز ئەوەندە بالّ بەرز بوو (، لاَ أَكَادُ أَرَى رَأْسَهُ طُولًا فِي السَّمَاءِ)ئەوەندە بالّ بەرز بوو لەئاسماندا سەریم نەئەبینی ئەوەندە بەرز بوو (وَإِذَا حَوْلَ الرَّجُلِ مِنْ أَكْثَرِ وِلْدَانٍ رَأَيْتُهُمْ قَطُّ) لەدەور و بەری ئەم پیاوە ئەوەندە مندال کۆببوویەوە شتی وام نەبینیبوو ئەوەندە زۆربوون ! !.

(قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: مَا هَذَا؟ مَا هَؤُلاَءِ؟)دەفەرمووی : پێم وتم : ئەمەچیە ؟ ئەمە کێن ئەمانە؟( قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقِ انْطَلِقْ)دەفەرمووی : پێیان وتم : برۆ برۆ ،برۆجارێ .

(، قَالَ: فَانْطَلَقْنَا فَانْتَهَيْنَا إِلَى رَوْضَةٍ عَظِيمَةٍ، لَمْ أَرَ رَوْضَةً قَطُّ أَعْظَمَ مِنْهَا وَلاَ أَحْسَنَ)پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی : رۆیشتین وسەیرمان کرد لەوێدا لەوحەیەکی زۆر گەورەی بینی بیستان و باخێکی زۆر گەورەی بینی شتی وامان نەبینیی بوو ئەوەندە جوان بوو (وَلاَ أَحْسَنَ).

(قَالَ: قَالاَ لِي: ارْقَ فِيهَا ، ،)دەفەرمووی : پێیان وتم :برۆ ، (قَالَ: فَارْتَقَيْنَا فِيهَا، فَانْتَهَيْنَا إِلَى مَدِينَةٍ مَبْنِيَّةٍ بِلَبِنِ ذَهَبٍ وَلَبِنِ فِضَّةٍ،) دەفەرموی ، رۆیشتین و شارێکمان بینی ئەو شارە

ئەوەندە جوان بوو بینا کرابوو بە خشتێك لە زێر و خشتێك لە زیو (فَأَتَيْنَا بَابَ المَدِينَةِ فَاسْتَفْتَحْنَا فَفُتِحَ لَنَا فَدَخَلْنَاهَا،)هاتینە بەر دەرگای ئەم شارە لەدەرگاماندا و دەرگامان بۆ کرایەوە و چوینە ژوورەوە (تَلَقَّانَا فِيهَا رِجَالٌ شَطْرٌ مِنْ خَلْقِهِمْ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ)کەسانێکمان بینی دوو بەش بوون یانی گیانیان کرابوو بە دوو بەش ، لایەکیان جوانترین شێوەیەیان هەبوو (وَشَطْرٌ كَأَقْبَحِ مَا أَنْتَ رَاءٍ،)لایەکەیتریان ناشترین شتێکە کە تۆ ببینی ئاوەها بوو ، لایەکیان زۆر زۆر جوان بوو وە لایەکیشیان زۆر زۆر ناشرین بوو ، واتا هەریەك لەو ئینسانانە بەشی لای راستیان جوان بوو بەشی لای چەپیان ناشرین بوو !.

(قَالَ: قَالاَ لَهُمْ: اذْهَبُوا فَقَعُوا فِي ذَلِكَ النَّهَرِ)پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی : ئەم دووانەی لەگەل پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بون بەو خەلکانەیان وت : برۆنە ناو ئەو رووبارەوە (قَالَ: وَإِذَا نَهَرٌ مُعْتَرِضٌ يَجْرِي كَأَنَّ مَاءَهُ المَحْضُ فِي البَيَاضِ)دەفەرمووی : ئاوێك ئەوەندە جوان بوو خالص سپی سپی (فَذَهَبُوا فَوَقَعُوا فِيهِ)چوون خۆیان خستە ناو ئاوەکەوە ئەو خەلکەی کەلەناو ئەم شارەدا بوون (ثُمَّ رَجَعُوا إِلَيْنَا قَدْ ذَهَبَ ذَلِكَ السُّوءُ عَنْهُمْ)کە هاتنەوە ئەو لایەی کە ناشرین بوو ئەوانیش جوان ببوو هیچ ناشرینیەکیان پێوە نەما بوو (فَصَارُوا فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ) لەجوانترین وێنەدا ئێمە ئەوانمان بینی .

(قَالَ: قَالاَ لِي: هَذِهِ جَنَّةُ عَدْنٍ وَهَذَاكَ مَنْزِلُكَ)پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی : ئینجا دواتر پێیان وتم : ئەمە جنەتی عەدنە ئەمەش شوێنەکەی تۆ ئالێرەدایە ئیتر ، (قَالَ: فَسَمَا بَصَرِي صُعُدًا)دەفەرمووی : سەرم بەرزکردەوە هەتا چی ببینیم ! (فَإِذَا قَصْرٌ مِثْلُ الرَّبَابَةِ البَيْضَاءِ)قەصرێکی ئەوەندە جوان وەکو پەلە هەورێکی سپی بەرز لەسەر یەك لەسەر یەك (قَالَ: قَالاَ لِي: هَذَاكَ مَنْزِلُكَ)دەفەرمووی : پێیان وتم : ئەمە شوێنی تۆیە ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم).

(قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: بَارَكَ اللَّهُ فِيكُمَا ذَرَانِي فَأَدْخُلَهُ)پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی :وازم لێبێنن دەبا بچمە ناویەوە بەرەکەتی الله تعالى تان لێ بێت ،!!( قَالاَ: أَمَّا

(الآنَ فَلاَ، وَأَنْتَ دَاخِلَهُ)دەفەرمووی : وتیان : ئێستا نا چونکە ئێستا ناتوانی بچیتە ناویەوە بەس تۆ هەر دەچیتە ناویەوە بەس ئێستا نا .

(قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا)دەفەرمووی : پێم وتن (فَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ مُنْذُ اللَّيْلَةِ عَجَبًا)من ئەم شەو شتێکی زۆر سەیرم بینی ! ئەم هەموو شتە سەیرە چیبوو دەپێم بلێن خەبەرەکەیم پێی بلێن (فَمَا هَذَا الَّذِي رَأَيْتُ؟)ئەوە چی بوو بۆم تەفسیر بکەن و بۆم شەرح بکەن ؟!

(قَالَ: قَالاَ لِي: أَمَا إِنَّا سَنُخْبِرُكَ،)پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی / پێیان وتم : ئێمە ئێستا پێت دەلێن یەك بەیەك هەموو ئەوەی کەوا بینیت پێت دەلێن کەوا ئەمانە چیە !!

(أَمَّا الرَّجُلُ الأَوَّلُ)پیاوەکەی یەکەم کە کەوتبوو و پیاوەکەی تر کەبەسەریەوە بوو بەتاشە بەرد ئەیکێشا بەسەریدا و سەری پان و پلیش ئەکردەوە و مێشکی ئەتەقاند ،ئەوە مەبەستەکەمانە باش ئاگادارین .( أَمَّا الرَّجُلُ الأَوَّلُ الَّذِي أَتَيْتَ عَلَيْهِ يُثْلَغُ رَأْسُهُ بِالحَجَرِ، فَإِنَّهُ الرَّجُلُ يَأْخُذُ القُرْآنَ فَيَرْفُضُهُ وَيَنَامُ عَنِ الصَّلاَةِ المَكْتُوبَةِ)ئەوە ئەو کەسەی کە سەری پان و پلیش ئەکرایەوە ئەو کەسەیە کەوا قورئانی وەرگرتوە و پاشان وازی لێهێناوە و نوێژە فەرزەکانی بەجێ دەهێلی و نایکات ئەخەوێت و وازی لێ ئەهێنی و قورئانەکە تەرك ئەکا ئەوەیە مەبەستەکەمان لێرەدا !!

ئەمە شمولی هەموو حاکمەکانی ئەم سەر زەوییە دەکا ئێستاکە ! قوربەسەر ئەو کەسەی کەوا قورئان تەرك ئەکات ، خاك بەسەر ئەو کەسەی کەوا ئیش بەقورئان ناکا ، دەبا بروا دۆلارەکەی و عەسکەرەکەی و تەکنەلۆجیاکەی و هەرچی لەسەر زەویدایە با رزگاری بکا ! هەی خاك بەسەر ئەو کەسەشی کەوا بەشوێنیدا ئەروا و تەئیدی ئەکا !! ئەمە کەمە ئەمە !؟ ئەی نامرین !؟ ئەی ناچینەوە بەردەمی الله تعالى ؟! تۆ قورئان رەفز ئەکەی ؟! قورئانت ناویی؟! ئەمە حالەکەتە !.

زانایان دەفەرموون : لەشەرحی حەدیسەکەدا یەك لەشەرحەکەی ئەلێن :ئەو کەسەی کەوا قورئان بەشەو ناخوێنێتەوەی قورئانی لەبەر و قورئانی وەرگرتوە و قورئان فێر بووە و بەشەو نایخوێنێتەوە ئەمە یەکێکە لەماناکانی !.

(وَيَنَامُ عَنِ الصَّلاَةِ المَكْتُوبَةِ)نوێژی بەیانی چی !! نوێژی نیوەرۆ و عەصرو مەغریب و عیشای چی !! گوێی پێی نادا .

جا ئیمامی إبن المنذر لەکیتابی ترغیب و ترهیب کە ئەم حەدیثەی ئیمامی بوخاری هێناوە ئەیکاتە بەلگەیەکی زۆر بەهێز کەوا نوێژنەکەر (تارك الصلاة )کافرە هەتا هەتایە ئەبێ ئاوای لێبکرێت لەجەهەنەمدا ، ئەوەشی کەوا قورئان تەرك ئەکا و ئیشی پێی ناکا !

زانایان دەفەرموون : ئەوەی قورئان ناخوێنێتەوە !! ئەی ئەوەی کە بلێ نەخێر هەر ئیشیشی پێی ناکەم ! ئەوەی بلێ نەواللە ئەمە شتێکی هیچ و پوچە بۆ عەرەبەکان هاتوە والعياذ بالله خۆی بەموسلمان ئەزانی !؟ .

(وَأَمَّا الرَّجُلُ الَّذِي أَتَيْتَ عَلَيْهِ، يُشَرْشَرُ شِدْقُهُ إِلَى قَفَاهُ، وَمَنْخِرُهُ إِلَى قَفَاهُ، وَعَيْنُهُ إِلَى قَفَاهُ، فَإِنَّهُ الرَّجُلُ يَغْدُو مِنْ بَيْتِهِ، فَيَكْذِبُ الكَذْبَةَ تَبْلُغُ الآفَاقَ) ئەوەکەیتریش کە دەم و لوت و چاویان بەقولاب پارچە پارچە ئەکرد و رایان ئەکێشا و ئەیان دراند ئەمە کەسی درۆزنە دێتە ناو خەلکەوە درۆیەك ئەکا ودرۆکەی ئەروات بۆ ئەم سەر و ئەو سەر خەلکیش درۆکەی ئەگێرنەوە ، ئەم سزای کەسی درۆزنە بەم شێوەیان لێدەکرێی !.

(وَأَمَّا الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ العُرَاةُ الَّذِينَ فِي مِثْلِ بِنَاءِ التَّنُّورِ)ئەما ژن و پیاوە رووت و قوتەکان کە لەناو تەنورەکەدا بوون (فَإِنَّهُمُ الزُّنَاةُ وَالزَّوَانِي)ئەمە زینا باز و زینا کەرەکانن لە ژنان لە پیاوان کە زینایان ئەکرد ، ئێستا ئا لەوێدا لەم تەنورەدا الله تعالى بەم شێوەیە سزایان ئەدا .

(وَأَمَّا الرَّجُلُ الَّذِي أَتَيْتَ عَلَيْهِ يَسْبَحُ فِي النَّهَرِ وَيُلْقَمُ الحَجَرَ، فَإِنَّهُ آكِلُ الرِّبَا،) وە ئەوکەسەی کە لەناو رووبارە خوێنەکەدا بوو و ئەهات و مەلەی ئەکرد و ئەهاتەوە بەردەمی کابرا و بەردێکی گەورەی ئەگرتە دەمی ئەوە ئەوکەسە کەسی ریبا خۆرە !! ئەوە ئەم کەسەیە کەوا قەرز ئەدا

لەبەر خاتری الله تعالی نادا بلیٚ قەرزەکەم بدەوە یان لیٚ خۆشبیٚت ، بەلکو ئەچی فائیدەی ئەخاتە سەر ! وەکو هەموو حوکمەتەکانی ئەم زەمانە کە هەموو بانك و مصرەفەکانیان بەریبا ئەروات بەریٚوە ، ئەی خاك بەسەر ئەو کەسەی کەوا کاتبە و کە شاهیدە کە پاسەوانی ئەم بانکەشە .

زانایان دەفەرموون: ئەمانە هەموویان تاوانبارن و بەشدارن ئا لەم ئیشەدا و بەشدارن لەم سزایەدا .

وە خاك بەسەر ئەو کەسەی بینای ئەم بانکە دروست ئەکا خاك بەسەر ئەو کەسەی کەوا پاسەوانی ئەم بانکە دەکا خاك بەسەر ئەو کەسەی کەوا کاتبی ئەم بانکەیە کە شاهیدەکەیەتی و کە مدیرەکەیەتی ! !

پیٚغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی : الله تعالی لەعنەتی کردوە لەو کەسەی کەوا ریباکە ئەنوسی ئەوەشی ئەبیٚ بەشایەت بەسەری ، لەعنەت بیٚت لیٚیان ! ئەوەشی ئەیخوا و ئەوەشی ئەیدریٚتی بیخوا .

کەمە !؟ ئەم عقوبە وسزایە کەمە ؟! لەعنەت کەمە ؟!

جا زانایان ئەلیٚن : بۆ بەرد ئەخاتە دەمی واتای هیچت دەست نەکەوت ، بزانە ! !

یانی مالەکەت زیادی نەکرد ، مالەکەت بەریبا زیاد ناکا الله تعالی دفەرمووی : (يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ)[43] الله تعالی ریبا چی لیٚ ئەکات ؟! بیٚ بەرەکەت ئەکا .

یانی ئیٚستا ئەگەر ئیٚمە بەحوکمی قورئان ئیش بکەین و قەرزیٚك بدریٚی بەئیٚمە بەئیٚمە بوتریٚی نیٚوەی قەرزەکەمام بدەرەوە ، بلیٚن نەخیٚر قەرزەکە وەکو خۆی بمان دەرەوە چەن خۆشە ! ! بەشەریعەتی ئیسلام ! بەڵام لەشەریعەتی کافرەکان دەلیٚن : دەبیٚ تۆ ئەوەندەش زیاد بدەی بەمەرجیشی ئەگریٚی ئەگەر نەت گەراندەوە لەفلان کات ئەوەندەشی غرامە ئەچیٚتە سەر

[43] :سورة البقرة اية : ٢٧٦

!! ئەزانن ئەم کێ یە ، ئەمە کەسێکە کەوا لە بەرامبەر خوا و پێغەمبەردا دەلێ من لەگەلتان ئەجەنگم و ئەی خوا وپێغەمبەر چی ئەکەی بیکە !!

ئەی قور بەسەر لەگەل خوا وپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەجەنگی ؟! لە نەصی قورئاندا الله تعالی دەفەرمووی : ئەو کەسانەی کەوا ریبا ئەخۆن (الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ۚ)[44] رۆژی قیامەت بەشێتی زیندوو ئەبێتەوە بەشێتی !!وەکو شەیطان دەستی لێی وەشاندبێ ئەوەها زیندوو ئەبێتەوە یانی تۆ بەم مەبلەغە بچوکە تۆ چیت لێ دێت ئەگەر وەریی نەگریت !؟ ئەو خەلکەش بۆ توشی نارەحەتی دەکەی !

(وَأَمَّا الرَّجُلُ الكَرِيهُ المَرْآةِ، الَّذِي عِنْدَ النَّارِ يَحُشُّهَا وَيَسْعَى حَوْلَهَا ،)ئەما ئەوپیاوە ناشرینەی کە لەدەوری ئاگرەکە دەسورایەوە ئاگرەکەی بلێسە پێ ئەدا (فَإِنَّهُ مَالِكٌ خَازِنُ جَهَنَّمَ)ئەوە ئەوە مالیکە دەرگاوانی جەهەنەم مەلائیکەی جەهەنەمە بەبەردەوام ئیشی ئاگر خۆش کردنە هیچ رەحم لەدلیاندا نیە ئەم مەلائیکەتانە ئەگەر الله تعالی کەسێکی خستە ناویەوە و وتی بیسوتێنن هەتا ئێوارە ئەو کەسە هاوار بکا هەروەکو لەم ئایەتەدا هاتووە (وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ۖ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ)[45] جەهەنەمیەکان دەلێن ئەی مالیك تخوا بەخواکەت بلێ با لەناومان ببا ئیتر بەسە !! دەفەرمووێ : نەخێر بەلکو دەبێ هەتا هەتاییە تێدا بمێنیتەوە !!

کام عەزاب و سزا گەورەترە عەزابی ستەمکاران یان عەزابی الله تعالی ! عەزابی ستەمکاران تۆ ئەگەر بیچێژی چەند سالێکیش بەردەوام بێ کۆتاییەکەی هەر بەمردن دێ ، بەس عەزابی الله تعالی کۆتایەکەی بەمردن نایە !! کەچی خەلك لە الله ناترسی لەئینسان و عەزابی ئینسانەکان ئەترسێ و لەعەزابی الله تعالی ناترسی ، پێویستە ئیمانەکەمان بەهێز بکەین خۆشەویستانم .

[44] سورة البقرة اية : ٢٧٥
[45] سورة الزخرف اية : ٧٧

(وَأَمَّا الرَّجُلُ الطَّوِيلُ الَّذِي فِي الرَّوْضَةِ)ئەی بالاً بەرزەکەی کە زۆر بالاً بەرز بوو لەباخچەکەدا ؟!

(فَإِنَّهُ إِبْرَاهِيمُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)ئەمە پێغەمبەر ئیبراهیم بوو (علیه الصلاة والسلام) (وَأَمَّا الوِلْدَانُ الَّذِينَ حَوْلَهُ)ئەی ئەو مندالانەی کەوا وێنەیان زۆر جوان و چەند زۆربوون ؟ (فَكُلُّ مَوْلُودٍ مَاتَ عَلَى الفِطْرَةِ)ئەوە مندالانی موسلمانن کە لەدایك وباوکی موسلمان دەبێ لەسەر فیطرەت ئەمرێی پێش ئەوەی بالغ ببن ئەمرن ئەمانە هەموویان ئەچنە بەهەشتەوە ئەمانە لەدەورو بەری ئیبراهیمن ، دلت خۆش بی ئەی دایك و باوکی موسلمان کاتێك مندالەکەت بەمندالی مردووە خەم مەخۆ کێ ئەلێ گەورە نابێت و توشی کوفر نابێ بەس بەمندالی رۆیشت تەکید بە زۆر وا لای پێغەمبەر ئیبراهیمە (علیه الصلاة والسلام) دلت خۆشبێ بەمە .

(قَالَ: فَقَالَ بَعْضُ المُسْلِمِينَ)دەفەرمووی : بەشێك بە موسلمانەکان پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کرد (يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَأَوْلاَدُ المُشْرِكِينَ؟)ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەی ئەولادی موشرکین چیان لێ دێی کە بەمندالی ئەمرن ؟!

(فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَأَوْلاَدُ المُشْرِكِينَ،)پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : مندالانی موشریکیشی هەر لەلایە .

رۆشەنکردنەوەیەك ئەدەین دەربارەی مندالانی موشرکین  ئەولادی موشرکین حوکمیان چیە؟ یانی کەسێك کە یەهودی و نەصرانی بێ مندالەکەی پێش ئەوەی بالغ بێ بمرێی ئەم مندالە حوکمی چیە ؟ بەهەشتیە یاخود جەهەنەمییە ؟!

بەپێ ئەم حەدیسەی کە لەبوخاری دا هەیە هەندێك لەئەهلی عیلم دەفەرموون : زاهیری حەدیسەکە کە وا دەگەیەنێی ئەوانیش إلحاق کران بە بەموسلمانەکانەوە یانی ئەوانیش لەبەر ئەوەی بێ تاوانن بۆ بەهەشت .

بەلاَم لەلای ئەهلی عیلم لەبەر بوونی حەدیثیتر ئەفەرموون : نەخێر مندالی موسلمان ئەچێتە بەهەشت بەلاَم مندالی کافر و موشریك تاقی ئەکرێتەوە لەرۆژی قیامەت چونکە هیچ کەسێکی کافر ناڕواتە ناو بەهەشت ئەوانیش تابیعن بۆ دایکان و باوکیان .

لەبەر ئەوە لەرۆژی قیامەت الله تعالی  ئاگرێکیان بۆ دەکاتەوە پێیان ئەلێ : برۆنە ناو ئەم ئاگرە ! ئەگەر رۆیشتن ئەچنە بەهەشت نەرۆیشتن ناچنە بەهەشت بەلکو ئەچنە جەهەنەم ، واتا هیچ کەسێك بەبێ عەمەل ناروا .

(وَأَمَّا القَوْمُ الَّذِينَ كَانُوا شَطْرٌ مِنْهُمْ حَسَنًا وَشَطْرٌ قَبِيحًا)ئەما ئەوانەی کەوا لایەکیان جوان بوو وە لایەکیتریان ناشرین بوو دواتر پێیان وترا برۆنە ناو ئەو رووبارە و پاك بوونەوە و جوان بوونەوە (فَإِنَّهُمْ قَوْمٌ خَلَطُوا عَمَلًا صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا ، تَجَاوَزَ اللَّهُ عَنْهُمْ) ئەمە کەسانێکن لەدونیادا چاکە و خراپەیان کردوە ، چاکەیان هەیە و خراپەشیان هەیە ، چاکەکەیە لایە جوانەکەیە خراپەکەشیان لایە خراپەکەیە ، بەلاَم کردەوەکەیان چاکە و خراپەیان وەکو یەك وایە هیچیان لەهیچی زۆرتر نیە ، چونکە ئەگەر چاکەت زۆربی بۆ بەهەشت وە خراپەشت زۆربێ بۆ جەهەنەم ، بەس وەکو یەك وابێ ئەچیتە ئەعراف ، بەلاَم ئەم جۆرە کەسانە الله تعالی نایان سوتێنی خاوێنیان ئەکاتەوە و الله تعالی ئەیانخاتە بەهەشت .

خۆشەویستانم ئاگاداری حەدیثەکە بن ئەوەی قورئانی وەرگرت و رەفزی کرد ! ئەوەی قورئانی وەرگرت و نەیخوێندەوە ! ئەوەی قورئانی وەرگرت و تەدەبوریی نەکرد ، ئەمە هەمووی موخالەفاتی قورئانە ئەمەش حوکمەکەیەتی پەنا ئەگرین بە الله تعالی .

با قورئان نەبێتە گۆرانی ، با قورئان نەبێتە سرود وە با قورئان نەبێتە شتێکی رەمزی !

بزانن لە دەولەتەکاندا چۆنە ؟! کەسێك ئەهێنن کەسێکی بەکرێی گیراو پارەیان داوەتێ ئا دەی وەرە دوو کەلیمەمان بۆ بخوێنە با حەفلەکەمان بەچەند ئایەتێك لەقورئانی پیرۆز برازێنینەوە دواتر باقی حەفەلەکە هەمووی دژی قورئانەکەیە ، بۆتە مۆدێل !

قورئان بۆ ئەوە نەکراوە سەرەتای حەفلەی پێی برازێنیتەوە ، بەلکو قورئان بۆ ئەوە کراوە تاوەکو بیکەیت بە مەنهەجی حەیات ئەمرۆ قورئان بۆ ئەم شتانە بەکارد یێ بەداخەوە ، ئەچێ بۆ سەر قەبران و پارەی پێ وەردەگرێی وا ئەزانی ئەو پارەیە لەگەرویی بەنۆش ئەچێتە خوارەوە والله با پێت بلێم بە ئاگر ئەچێتە خوارەوە باش بزانە چونکە ئەوە لێرەدا هیچ

زانایەك لەزاناكان نەی وتوە ئەم پارەیە حەلالە كە تۆ وەری دەگریی ، ئەی خاك بەسەر ئەو كەسەشی ئەچیَ تەعزییە دەكا و پارە ئەدا بەم كەسانە و قورئان ئاوا لیَ دەكا بەم شێوەیە .

خۆشەویستانم باش بزانن : تەعزییە لەدینی ئیسلامدا نیە بەم شێوەیە دابنیشن بۆ تەعزییە و فاتحە بخوێنی ،بە واللە نیە !. ئەوە ئیمامی شافعی دەفەرمووی : ئەم شتە حەرامە و نابیَ كەس بیكات .

ئیمامی شیرازی لە مهذەب دەفەرمووی : نابیَ و حەرامە .

وە لەشەرحی مهذەب دەفەرمویو : حەرامە و بیدعەیە نابیَ ئەم شتانە بكرێی .

كوا مەلا و مامۆستاكانی شافعی مەزهەبەكان !؟ كوا لەبەر چی قسە ناكەن ؟! حەز دەكەن پارە بخۆن ! یان لەترسی خەلك قسە ناكەن !؟ هەردووكی زەرەرە ، لەبەر خوا بلیَ نیە ، بەش بەحالی خۆم بە فەزلی اللە تعالی هەركەسێك مردبیَ چوارشتی لەسەر شانمان بیكەین بۆی لەگەلیان ئەگەر توانی بێتمان كردوومانە ، شوشتنی و كفن كردنی و نوێژ كردن لەسەری و بردنی بۆ سەر قەبران و ناشتنی .

ئیتر تەواو باقیەكەیتر باوكم بوە و دایكم بوە باپیرم بووە و داپیرم بووە خالم بوە و مام بوە نەچومەتە ناو تەعزیەوە ، چونكە ئەگەر ئێمەی مامۆستا چوینە ناو تەعزیەوە خەلك ئەلیَ ئەی مامۆستا فلان بۆ دێی !! تۆ مەچۆ بزانم خەلك دای ئەمەزرێنی !

لەبەر ئەوە هەر كەسێك لەئێوە مرد برا بەرێزەكەم چاوەروانی من مەكەن بێمە مەجلیسێكەوە بلێن (الفاتحە) ئەوە من بەخیانەتی ئەزانم نایمە ناو ئەو مەجلیسانەوە .

قورئان ئاوەها لی ناكەین بەلكو قورئان دەخوێنینەوە بەلكو بزانین ئەلیَ چی بۆ ئەوەی رەفتاری پیَ بكەین ئەلیَ نوێژ بكە و رۆژوو بگرە و عیبادەت بكە ئەمانە بۆخۆتە ، لەدونیاكەت بیكە كە مردنی هیچ سوودت پیَ ناگەیەنی ئەگەر نەت كرد (الفاتحە )هیچ سودت پیَ ناگەیەنی ئەگەر نەت كردبێتە مەنهەج ، تەواو كەسەكە ماركسیە و شیوعییە و بروای بە اللە تعالی نیە ئەچن تەعزیەكی بۆ ئەگرن و ئەلێن (الفاتحە ) بۆ رۆحی فلان ، بۆ لەدونیا زۆر ئیشی پێی

کردوه تاوەکو بۆ رۆحی بینێرێی ؟!  خۆ ئەگەر ئیشیشی پێکردبێ بۆی ناچێ چ جای ئیشی پێ نەکردبێ ، ئەمە خیانەت نیە لەقورئان ؟ بەلێ ئەمە خیانەتە لەقورئان ..

## تێنەگەیشتن لەمانای ئایەتەکان

یەکێك لەو موخالافاتانەی کەوا موسلمانان دەیکەن بەدەرهەقی ئەم قورئانە پیرۆزە ئەوەیە کە ئەیخوێنێتەوە و گوێنادا بە تێگەیشتن لە قورئانەکە بەس ئەوەندە کەلیماتەکان دەخوێنێتەوە ، لەگەل ئەوەشدا وای بۆ دەرئەکەوێ کەوا حەقی قورئانەکەی داوە و ئەلێت من قورئان ئەخوێنمەوە ! .

الله تعالى قورئانی بۆ ئەوە داناوە کە لێ تێبگەیت الله تعالى دەفەرمووی : (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا)[٤٦] بۆ نایەن ئایەتەکان لێك بدەنەوە بۆ نایەن تێبگەن یاخود ئێوە دلتان قفلی لێدراوە !! کەواتە هەر خوێندنەوە بەس نیە خۆشەویستانم .

باسی تێگەیشتن ئەکەین لە قورئانی پیرۆز ، کەپێویستە زۆر حیرصمان لەسەری هەبێت لەبەر چەن شتێك ، بۆ ئەبێت لەقورئان تێبگەین !؟

یەکەم: هەمووتان ئەزانن  قورئان ئەصلی هەموو ئصولەکانە وە قاعیدەی ئەساسی دینە ، چاکیەتی دین و دونیای ئێمە بەم قورئانەوەیە ئەم قورئانەمان لەناودا نەمێنی ئیتر تیادەچین و مال وێران دەبین ، هەر یەکێك لەئێمە ئەتوانی لەدوای فەزلی الله تعالى بەهۆی ئەو قورئانەوە ئاخیرەتی خۆیی دابین بکات و بەرەو بەهەشتی الله تعالى بروا ، بەبێ ئەم قورئانە مەحالە تۆ بڕۆیت ، چونکە الله تعالى فەرموویەتی :  ئەگەر هیدایەتی من هاتە خوارەوە هەرکەسێك شوێنی بکەوێت ئەوە ئەم کەسە غەمگین نابێ و خەفەت ناخوا و توشی سەر لێشێواوی و مال وێرانی نابێ ، کەواتە پێچەوانەکەی راستە ، یانی ئەگەر شوێنی نەکەوتی و نەت خوێندەوە و

[٤٦] :سورة محمد اية : ٢٤

کارت پێ نەکرد ئەوە ئەکاتە بەراستیەکەی ماڵ وێران دەبیت ، شوێن هەر ڕێبازێکیتر کەوتی هەرکەسێکیش دایبنێت !

الله تعالی بۆیە ئەم قورئانەی ناردوە تاوەکو کاری پێ بکرێت بۆ ئەوە دانەنراوە تاوەکو تەنها دابنرێی بکرەێی بە گۆرانی ونەشید و بکرێی بە رازاندنەوەی دەنگەکان ، وە چەندەها کەس هەیەکەوا قورئان دەخوێنێتەوە و لەقورئانیش نەگەیشتوە ، وەکو باسمان کرد لەسەر تەلەفزیۆن و رادیۆ و لەناو مزگەوتەکاندا کەسی وا دانراوە پێ دەلێن دەی تۆ تەقلیدی سعدمان بۆ بکەوە ! ئادەی تۆ تەقلیدی مەنشاویم بۆ بکەرەوە ! ئادەی لاسایی فلان کەسم بۆ بکەرەوە ! ئینجا دەلێن : بینیوتە مامۆستا چەنێك دەنگی خۆشە !! کەچی کە سەیری ئەکەی ئەم قورئان خوێنە موشریکە !! ئەلێت : (یارسول الله هاوار)!! (صلی الله علیه وسلم). ئەمە موشریکە ئەم کەسە لەلای الله تعالی وەکو ئەبو جەهل وایە چەندەها جاریش قورئان بخوێنێتەوە بۆیە تۆ بەدەنگەکەی هەلمەخەلەتێ ، تۆ سەیر بکە بزانە لەقورئانە کە تێگەیشتووە خۆشەویستانم .

ئایا ئەم قورئانە کەهاتۆتە خوارەوە بۆ ئەوەی کاری پێ بکەی هەتاوەکو تێی نەگەیت ئەتوانی کاری پێ بکەیت !؟

هیچ شتێك بووە تاوەکو تێ ی نەگەیت تەشبیه نەبێت بە قورئانی پیرۆز وەرە سەیری هەر ئامێرێك بکە کاتێك کە کەتەلۆکێکی لەگەل دایە هەتا تۆ لەو کەتەلۆکە تێ نەگەیت چی ئەلێ خال بەخال نازانی چۆن ئەم ئامێرە بەکار بهێنی ، بە موجەرەد خوێندنەوەی ئەزانی ؟! نەخێر بەلکو دەبێ تێبگەیت و بزانیت چیە ئەم بابەتە تەشبهە نەبێت بەقورئانی پیرۆز ، قورئان ئەبێت تێی بگەیت بۆیە الله تعالی داوای فەهم و تێگەیشتنی کردوە بۆیە ئەبێ ئایەت ئایەتی برۆیی هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وابوون تێپەریان نەئەکرد بەسەر ئایەتدا هەتاوەکو تێی نەگەیشتبانایە و کاریشیان پێ نەکردبایە .

دەلێن : وێنەی ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێتەوە و تێناگات ئەزانن وەکو کی وایە ؟!

نمونەیەکەمان بۆ دەهێنەوە و دەڵێن :

مەلیکێك کیتابێك بنوسی بۆ قەومەکەی پێیان بڵێ ئاگاتان لەخۆتان بێ دووژمن لەو ڕێگە و لەو ڕێگەیەو دێت و لەو ڕێگایانە مەڕۆن ! بەلکو لەم ڕێگایەدا برۆن ڕزگارتان ئەبێت ! .

ئەوانیش کیتابەکە بێنن بەس بیخوێنەوە وەکو گۆرانی و بیخەنە سەرسەریان و ماچی بکەن و بەلاَم ئیشی پێی نەکەن و تێی نەگەن لەو ڕێگەیەدا برۆن کە مەلیکەکە وتی مەڕۆن دووژمن چی یان لێ دەکات ؟! پارچە پارچەیان لێ دەکا هەزار کیتابی مەلیکیان پێی بێت و ماچی بکەن و بیکەن بە گۆرانی هیچ سودی نیە لەبەر ئەوەی تازە تیاچوویت.

ولله مثل الأعلى قورئانی پیرۆز پێ مان دەلێ : ئەم ڕێچکانە مەگرنە بەر چونکە لەناو ئەچن بەلکو ئەو ڕێگەیەی من بگرنە بەر ڕزگارتان ئەبێ ، کەچی سەیر دەکەی ئەیخوێنێتەوەو بە ئەنواع و ئەشکال سەوت و مەقام بەس کاری پێی ناکات چونکە تێی نەگەیشتووە .

الله تعالى لەقورئانەکەی پێت ئەلێ : تۆ نابێ شەریك بۆ الله تعالى پەیا بکەیت (إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ)[47] .

ئێستا بەر هەریەکێکتان بلێم حاشا لەرووتان ، ئەگەر فەساد لەگەل خێزان و کچ و دایکتان دا بکرێ ڕازی ئەبن !؟ یەکەسەر ئەو کەسە شێت ئەبێ ئەگەر لەمزگەوتێکدا زینایەك بکرێ چی ئەکەن !؟ یاخود کچ و کورێك یەکتری لەباوەش بگرن چی ئەکەن ؟! شێت ئەبن ! !

بەلاَم لەو گەورەتر چیە کوفر بە الله یە لەو گەورەتر شیرك بە الله یە ، لەلای الله تعالى ئەفەرموێت : (إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ ۚ)[48] الله تعالى لەهەموو گوناهەکان خۆش دەبێ بەس لەشیرك خۆش نابێ ئەگەر تەوبەی لێ نەکەن ئاگاتان لە ئایەتەکە بێت و لێتان تێك نەچێت لەگەل ئایەتەکەیتر کە دەفەرمووی : (إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ)[49] ئەمە ئەگەر تەوبە بکەیت بەس ئەگەر تەوبە نەکەیت لەگوناهەکە

[47] :سورة لقمان اية :١٣
[48] :سورة النساء اية : ٤٨
[49] : سورة الزمر اية :٥٣

موحتەمەلە لەهەموو گوناهەکانت خۆشبێ لەزینا و لەدزی و لەو شتانەی کە گوناھ ومەعصیەتن بەلاًم هیچ کاتێك لە شیرك و کوفر خۆش نابێ الله تعالی ئەگەر تەوبەی لێ نەکەیت .

واتا ئەگەر تەوبەت لەشیرك و کوفر نەکرد مردیت ئەوە بۆ ناو جەهەنەمی هەتا هەتایە (إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ ۚ)[50] وەکو الله تعالی دەفەرموی : ئەوەی شەریك بۆ الله تعالی بریار بدا (فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ ۚ)ئەوە الله تعالی بەهەشتی لەسەر حەرام کردوە و بەهەتا هەتایی لەناو ئاگری جەهەنەمدایە ، بەس نالێ ئەوەی کەوا زینای کردوە یان ئەوەی ریبا بخوا بەهەشتی لێ حەرام کردوە نەخێر وا نالێ بەلکو ئەمە تەنها بۆ شیرکە ، بۆیە باش ئاگاداربە بزانە شیرك لەمانە گەورەترە ، کەچی لەناو مزگەوتەکاندا شیرك ئەکرێ !! بەناوی دینیشەوە ئەلێن ماشا الله چەنێك دەنگی خۆشە ، بەس ئەگەر دزیەك بکرێ و مۆبایلیەکەی بدزرێ دونیا ئەهێنێتە خوارەوە ، خۆ گەورەیە دزی نالێم گەورە نیە گوناهی گەورەیە بەس لەو گەورەتر هەیە خۆ زینا گەورەیە بەس لەو گەورەتر هەیە بزانە خەلکی ئێستا تێنگا لە گوناهەکان گوناهی گەورە گەورە کە شیرکە کەناهێلیت بچیتە بەهەشت ئەمە لەپێشترە کە تۆ بنەبری بکەیت کەچی ئەمە لەلای قورئان خوێنەکانمان هەیە .

کەواتە بە فەهم و تێگەیشتن لەو قورئانە تۆ ئەتوانی نەکەویتە ناو ئەم شیرکەوە خۆشەویستانم بۆیە ئەبێت ئێمە لەقورئان تێبگەین.

دووەم : ئەلێن : ئەگەر تۆ لەقورئان تێ ی نەگەیت علیم لەناو ئەچێت و بەرز ئەبێتەوە و لەناومان دا نامێنی .

حەدیثیکی صەحیح مان هەیە ئەبو الدرظ ئەی گێرێتەوە و وتی ئێمە لەگەل پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دابووین پێغەمبەرەکەمان (صلی الله علیه وسلم)سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و چاوی برییە ئاسمان (فشخص ببصره إلى السماء ثم قال : " هذا أوان يختلس فيه

[50] :سورة المائدة اية : ٧٣

العلم من الناس)ئەمە ئەو کاتەیە کە ئیتر خەریکە عیلم لەخەلکی بسەنرێتەوە لەناو خەلکدا نامێنی (حتى لا يقدروا منه على شيء .)[٥١]هەتا وای لیَ دێی هیچ علمیان پێی نامێنی ، دەفەرموون : ئەم قسەی کرد زیادی کوری لەبیدی ئەنصاری یەکێك بوو لە هاوەڵە بەرێزەکان فەرمووی : (وكيف يختلس منا وقد قرأنا القرآن ؟)ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چۆن ئەم عیلمەمان لیَ ئەسەنرێتەوە خۆ ئێمە قورئانمان خوێندوە ؟! (فوالله لنقرأنه ولنقرئنه نساءنا وأبناءنا ،)فەرمووی : والله ی ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئێمە قورئانەکە دەخوێنینەوە وە بەژنەکان و مندالەکانیشمان ئەلێنەوە (ئەها هاوەڵەکان چۆن بوون ، کێی تان بە ژن و مندالەکانی ئەلێتەوە ؟! یا بەس باسی مامۆستاکانی ئاینی بکەین !! ئا وەرە خێزانەکەم بزانم تۆ خێزانی منی ئەبیَ تۆ لەدین شارەزا بیت ئەبیَ تۆ ژنانی موسلمانان تیَ بگەیەنی ، والله و الله ژنی مامۆستای ئاینی هەیە قل لە فل جیاناکاتەوە !ئەمە گوناه نیە !؟ من برۆم خەلك فێر بکەم بەس ژنەکەم و مندالەکەم بی عیلم بن !! ئەمە راستە !؟ ئەمە لەلای مامۆستایانی ئاینی ، ئەی لەلای عامی خەلك ئەوە مەپرسە ! نازانی قورئان چەن سورەتیشی تێدایە وە نازانی باسی چی ئەکات ) هاوەڵە بەرێزەکە دەلیَ والله سوێند ئەخوات ئەلیَ والله ی ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)دەیخوێنینەوە ژنەکان و مندالەکانیشمان فێر ئەکەین .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جوابی دایەوە و فەرمووی : (ثكلتك أمك يا زياد) ئەم عیربارەتە بەرەکار دەهێنرێی لەکوردیدا واتا لەبار دایکت بچیت ئەی زیاد (إني كنت لأعدك من فقهاء أهل المدينة) خۆم وام ئەزانی تۆ لەتێگەیشتوانی ئەهلی مەدینەی ! وادیارە لەقسەکەم تێی نەگەیشتی (هذا التوراة والإنجيل عند اليهود والنصارى فماذا يغني عنهم ؟ ")ئەمە ئینجل و تەورات نیە لەلای یەهود و نەصرانیەکان (جا ئەو زەمەنە سەیر بکەن ١٤٠٠ساڵ زیاتر پێش ئێستا ) چ سودێکی پیَ گەیاندن ئەو ئینجیل و تەواراتە بەمانە !؟

[٥١] : مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح ،كتاب العلم ، جزء١ ص٣٢٠ رقم الحديث :٢٤٥،' رواه الترمذي .

(قال جبير : فلقيت عبادة بن الصامت ،)جوبێر دەفەرمووی : من عوبادەی کوری صامتم بینی که هاوەڵی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو پێم وت : (فقلت له : ألا تسمع ما يقول أخوك أبو الدرداء)تۆ گوێت لێی نیە کە ئەبو دردائ چی دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ! (وأخبرته بالذي قال)وتم : ئەمەی وت حەدیسەکەی بۆ گێڕایەوە .

(، قال : صدق أبو الدرداء)بەلی راست دەکا ئەبو درداء (إن شئت)ئەگەر ئەتەوێت (لأحدثنك بأول علم يرفع من الناس)ئەگەر ئەتەوێت یەکەم عیلم کە ئێستا لەناو خەلکی دا نەماوە پێت ئەلێم چیە ؟! (الخشوع ، يوشك أن تدخل مسجد الجماعة فلا ترى فيه رجلا خاشعا " .)[52] نەمانی خشوع ، فەرمووی برۆ ناو مزگەوتێك نابینی تەوە بەدەگمەن إلا کەسێکی تێدا نیە لەنوێژەکەیدا خاشع بێ لەخوا بترسی و رەنگی تێك چوو بێ ولەبەر دەمی الله تعالى کە مەلیماتەکان ئەلیٚ بزانی کەوا وتو وێژ لەگەل الله تعالى دا دەکا .

ئەو کاتە وایان وتوە ئەی رەحمەتی الله تعالى یان لیٚ بێت ئەی ئێستا ئەبیٚ چی بلێن ، بۆچی دێی بۆ مزگەوت لێت ئەپرسم بۆ دێت ؟ کاتێك کە لەمال ئەچیتە دەرەوە ئەبیٚ ئاگات لە عیلمەکە بێت بەدەست نوێژەوە بێت و هەنگا و بەهەنگاو بیژمێریت و بلێت : خوایە هەر هەنگاوێك وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وتویەتی : چاکەیەکت دەست دەکەوێت وخراپەیەکەت لەسەر لا ئەبا بۆیە من ئەرۆم بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی الله تعالى لێم خۆش بێت ، بۆ ئەوەی لەگوناهەکانم خۆش بێت ئەچم لەگەل الله تعالى دا بەجەماعەت وتو وێژ ئەکەم لەگەل موسلمانانداا (ارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ)[53] خۆم زەلیل ئەکەم بۆ تۆ ئەی خوای تعالى دێم و هەلەم کردوە و بەلێنت ئەدەمی کەوا تەنها تۆ ئەپەرستم و لەتۆ زیاتر ناپەرستم وەلەتۆ زیاتریش بەقسەی کەسیتر ناکەم وە لەتۆش زیاتر داوای یارمەتی لەکەس ناکەم !! تخوا خەلك ئاوا دێت بۆ مزگەوت !؟ تخوا کە لەمالەوە دێتە مزگەوت بەم نیەتەوە دێت !؟ ئەگەر وایە ئەوە الحمدلله پیرۆزی بێت ، بەلاٚم زۆربەی وانیە لەزەمەنی هاوەڵەکان خشوع نەما و وای

---

[52] : االمستدرك على الصحيحين كتاب العلم هذا أوان يختلس العلم من الناس أول علم يرفع من الناس الخشوع ، جزء١ ص٢٩٣
[53] :سورة البقرة اية : ٤٣

لێهات ، ئەفەرمووێی : ئەچیتە مزگەوتێکەوە خاشعێك نابینی ئەو عیلمە بەرزبوویەوە تەواو بەس حەراکاتە،

ئینجا هەر گلییەیان چیە مامۆستا درێژی کردوە چی بۆ وابوو چی ئەوە بوو !! یانی ئاگای لەوە نیە کە هاتووە بۆ لای الله تبارك وتعالی بلێت یا الله هاتووم لێم خۆشبی بەناو ئاگریشدا تیَ دەپەری ئەوکاتە بەدرك و تالیشدا ئەرۆیی نارەحەترین رێگا ئەگریتە بەر گەر بچیتە لای الله تعالی و پێی بلێت یا الله هاتووم لێم خۆشبە پێش ئەوەی بمخاتە جەهەنەم پێش ئەوەی رۆژی قیامەت بیَ بەگریان و بەداوای لێبوردنەوە ئەچی بۆ لای الله تعالی با ئەو خشوع و ئەو زەلیلەیەمان هەبیَ بۆ الله تعالی .

کەواتە لەناو چونی عیلم بەنەمانی وجودی ئەو کەسانەیە کە پێی هەلدەستن ، ئەگەر قورئان لەم کیتابەدا بیَ هەموو ئایەتەکانی الله تعالی لەم کیتابەدا بیَ کەمن و تۆ نەمان خوێندەوە و عەمەلمان پیَ نەکرد و ئەوکاتە بون و نەبونی وەکو یەك وایە ئەم قورئانە ، بۆیە دەبیَ ئەم قورئانە تۆ پێی هەلبستیت و جیَ بەجیَ بکەیت .

بۆیە دایکمان عائیشە (رەزاو رەحمەتی الله تعالی لیَ بێت) دەفەرموویی : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)چی بوو ؟ کاتیَ پرسیاری ئەخلاقیان لیَ کرد فەرموی : (کان خلقه القرآن)[٥٤] قورئانێکی گەرۆك بوو ، قورئانێکی بەجەستە بوو (أی ان صحت تعبیر )هەموو ژیان و هەموو کردەوەی بریتی بوو لە بەجێهیناوی ئایەتەکانی الله تبارك وتعالی .

کەواتە ئەگەر عیلمەکە هەلی نەگرین سودی نەما بەم شێوەیە بەرز دەبێتەوە وە ئەگەر تێی نەگەیت بەجوانی ئەروات جا بۆیە لەحەدیثێکتردا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : الله تعالی عیلم هەلناگرێتەوە وەکو قورئانەکە هەتا رۆژی قیامەت هەر ئەمێنی تا کاتی خۆیی بەس زانا و عولەماکان لەناو ئەبات ، چونکە سونەتی الله تعالی یە نابیَ زانایان هەتا هەتا بمێنێتەوە کە زاناکان نەمان ئیتر عیلمەکە لە سینگیدا ئەچێتە ناو گۆرەکەیەوە ، کە عالم نەما سەرکردەی جەهل و نەزان ئەبێت عالم بۆ مان (أئمة المضلین)کە پێغەمبەری خوا

---

[٥٤] : صحیح المسلم

(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی : لە مەسیحی دەجال زیاتر لەچی ئەترسیم لەئێوە ؟! لەمەلایان و لەمامۆستایانی سەر لێشێواو کە سەرتان لێ بشێوێنی ، عیلمیان نیە (قال الله و قال الرسول ) نیە بەلکو هەر دەلێن وام پێ باشە ئەبێ وابکەین !! پرسیاری لێ دەکەن ئەلێ قەیچیەکە تۆ ئەمە بکە و ئەمە مەکە بەکەیفی خۆیی کە وەکو ئەوەی کەوا ئەو خوا بێ والعیاذ بالله !!خۆی فەتوا دەر ئەکات .

هاوەڵە بەرێزەکان عادەتیان وابوو ئەگەر پرسیارێکیان لێ بکرابایە ئەگەر پینج شەشێك بوونایە کەسیان وەلامی نەئەدایەوە هەریەکە و ئەیوت با ئەویتریان وەلام بداتەوە لەترسا ئەیوت نەوەکو وانەبێ بەدینی الله نەبێ قسە ناکەم لەسەرم دەکەوێی ئەگەر وانەبێ و ماڵ وێران ئەبم!! کەچی ئەمرۆ هەر کەسە و سینگلی دەر ئەپەرێنی و نەشارەزایە و هیچ نازانی کەچی خۆی لێکردووم بەعالم ئەگەر تۆ پێتە قورئانم بدەرێی وە ئەگەر پێتە حەدیسم بدەرێی ، کەچێ دێت موقارەنە ئەکات لەنێوان ئەم مزگەوت و ئەومزگەوتیتر ئەلێ نازانم کێ راستە ؟!!

تۆ خوێندەواریی ؟! ئەگەر خوێندەواری برۆ بۆ قورئانەکە برۆ بۆ حەدیسەکە ئینجا ئەزانی کێ راستە برۆ بۆ قەولی صەحابە ئەزانی کێ راستە ، بەس کە تۆ نەخوێندەوار بی و لەمامۆستای جاهیل و نەزانت وەرگرت ئەری والله ئەوکاتە کێ دەنگی خۆش بوو یان کێ بیدعەی زۆر بوو یان کێ شیرکی زۆر بوو ئەچیت بۆلای ئەو کەسە نایتەوە بۆلای عیلمی راستەقینەکەی الله تعالی .

ئاگاداری ئەم خالە بن موقارەنەکردن بەچی دەبێ ؟ بەزۆری و کەمی نیە بلێ فلان مامۆستا زۆری بەدواوەیە کەچی فلان مامۆستا کەمی بەدواوەیە !! جا خۆ بەوە بێ پێغەمبەر هەبووە کەسی بەدواوە نەبووە (علیهم الصلاة والسلام) بۆخۆی چۆتە ناو بەهەشتەوە و ئومەتەکەی هەمووی بۆ جەهەنەم ، خۆشەویستانم شوێن عیلم بکەون عیلم نامێنی .

حەدیثیکیتر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : رۆژی قیامەت ئەم قورئانە سینگدا نامێنی وە لەناو قورئانەکەشدا نامێنی و کە هەلدەستی قورئانەکە ئەکەیتەوە سپییە و هیچی تێدا نیە .

پێش ئەو رۆژە تۆ بچۆرە خزمەتی قورئان لەبەری بکە و تێی بگە و سودی لێ بکە ، کەواتە ئەصلی عیلمەکە مەوجودە بەس کە من و تۆ هەلنەستاین بیخوێنینەوە و کاری پێ بکەین ئەو کاتە وەکو خۆیی ئەمێنێتەوە بون و نەبونی وەکو یەك وایە .

سێ یەم : ئەجرو ثەوابێکی زۆر گەورە هەیە بۆ ئەو کەسەی کە عیلم فێر ئەبێت ئاگاداربن ئەم چەند دەقە وسەعات و کاتەی تۆ کە دائەنیشی بزانە لەلای الله تعالی چۆنە بۆ تۆ ! ؟

عوقبەی کوری عامری کور جهنی ئەگێرێتەوە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێت) رۆژێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هات بۆ مزگەوت ئێمە لە صوفەدا[55] بووین ئەلێ هات بۆ مزگەوتەکە ژوری دایکمان عائیشە لەتەنیشت مزگەوتەکەوە بوو حوجراتەکانی بەدەوری مزگەوتەکەوە بوون وتی هات و هات بۆ لامان کەهات بۆ لامان فەرمووی کێتان هەیە لەئێوە حەزبکا و بروات بۆ ئەم دەشتە و لەوێی دوو حوشتری رێك و پێك و چاك و قەلەوی دەست بکەوێی ؟بەبێ ئەوەی توشی هیچ نارەحەتێکیش ببێ بەبێ ئەوەی توشی گوناە و توشی قەطعی رەحمم ببێ ؟

وتیان : والله هەموومان حەز دەکەین ، ( جا ئەو کاتە حوشتر زۆر بەبەها بوو وەکو ئێستا بلێن کێتان حەز دەکا کام سەیارە زۆر باشە ئێستا دوو سەیارەی باشی ئەو سەردەمی خۆی دەست بکەوێی ؟) هەمووی ئەلێ والله حەز دەکەین .

---

[55] : بریتی بوون لە فەقیرەکانی هاوەلاَن کە لەبەشی ئاخیری مزگەوتەکەوە کەپرێکیان کردبوو ئەوانەی کەوا ماڵ و حالیان نەبوو و سەفەری بوون جا ئەهلی صوفە زۆر بوون نا و بەناو ئەهاتن و ئەرۆیشتن خەوتن خەلکی خواردن و شتی بۆ دەهێنان فەقیر بون .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : دەی ئەگەر بەیانی یەك لەئێوە بروا بۆ مزگەوت دوو ئایەت فێر بێت لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (٣))[٥٦] بزانی ماناکەی چیە نمونەی ئەم دووانە ، فەرمووی : والله ئەوە لەدوو حوشتر باشترێکە لەلای الله تعالی بۆیی .!! ئەگەر سێ بوو لەسێ ئەگەر چوار بوو لەچوار هەتا دوایی ،،،

ئەم ئەجرە گەورەیەت دەست دەکەوێی خۆشەویستانم دابنیشە لەخزمەتی قورئاندا ئەو ئایەتانەت بۆ باس دەکرێی ئەو فەرموودانەی پێغەمبەری خوات (صلى الله عليه وسلم) ت بۆ باس دەکرێی سودی لێ ببینە و ئەجرێکی گەورەی تێدایە بۆتۆ جا ئەوە بۆ الله یە بەلاّم ئەبینی کەم کەس دێی و پێ بێتاقەت ئەبێ بەلاّم بۆ دونیا ئەوە سەرەتاییە و ناوەندی و ئامادەیی و کولیە هەیە دەچن و دینێرن لەبەرچی چونکە پارەی تێدایە هەر دەلێن برۆ کوری من با موستەقبەلت نەفەوتێی چونکە پارەیە !! دەی ئێستا بلێم هەر یەك لەئێوە وەکو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویی : هەر کەسێك بێت و یەك ئایەت فێر بێت باشترین جۆری ئۆتومبێلی ئەدەمێی !! دێت یاخود نا ؟! دەلێ : والله مامۆستا حەزم لە بیست ئایەتە !! حەز ئەکەم ٣٠ ئایەتەم پێی بلێ !! هیچ کات بێ تاقەت نابێ خۆی وایە تەبعی ئینسان وایە .

هاوەلّە بەرێزەکان ئاوا بوون بە ئینسانی بەهێز و بەجەرگ و لێهاتوو بەم شێوەیە دونیایان لەم سەر تا ئەو سەری دونیایان فەتح کرد و کامەی خۆی بەپیاو و شەهامەت ئەزانی لەبەر دەستیاندا زەلیل بوو ! هەر لەدوورەوە لێیان ئەتۆقین چونکە ئا بەم عیلمەوە رۆیشتن کە ئەو جیلەی قورئان پەروەردەی کرد نەما ئەم جیلەی ئێستای لێهات کە هەمووی ترسنۆك و زۆربەی زۆری !! ئێستا کێ ئەتوانی بەسەراحەت قسە بکا بلێ هەرچی رێگە هەیە بەتالّە بەس رێگاکەی الله تعالى راستە !؟ برۆ بەهەموو حیزبەکان بلێ برۆ بەهەموو لایەنەکان بلێ !! کەچی ئەلێ نەبابە وسبە بەخوا مەعاشەکەم ئەبرن ، مامۆستای ئاینیە ئەلێم کاکە تۆ بۆ ریشت نیە !؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : ئەبێ ریشت هەبێ واجبە ، ئەو

[٥٦] سورة الفاتحة:

خەلكە لەترسا ئەلیٚ ئەم گرن ناهیٚلنەوە تۆ بۆچی خۆ تۆ مامۆستای !!! ئەلیٚ: بەخوا دوایە پیٚم ئەلیٚن ئەوە ئیسلامیە !! ئەوە مامۆستای ئاینەکەمانە !! بەس حوکمەت پیٚی بلیٚ ئەوەی ریش بیٚلیٚتەوە هەموو رۆژی وەرەقەیەکی ئەدەمی واللە ی هەمووی یەك مەتر دریٚژی ئەکات !! (إنا لله وإنا اليه راجعون).

جا دەلیٚ : سەیری عیلم بکەن کە باشترین کردەوە بیٚ وە خۆشەویسترین کردەوە بیٚ وە ئەشرەفترینی کردەوە بیٚ وە هەر عیلمیٚك بەپیٚی شەرەفەکەی خۆیەتی .

کەواتە گەورەترین عیلم چیە ؟ قورئانە . چونکە پەیوەستە بە رب العالمین کەملامی الله تعالی یە لەهەمووان گەورەترە کەواتە ئەبیٚ ئەو علیمە لەهەمووی گەورەتر بیٚ (علیمی تەفسیر و علیمی قورئان ) لەهەموو عیلمیٚك گەورەترە ، بۆیە برۆنە خزمەتی قورئانی پیرۆز .

چوارەم : ئەگەر ئیٚمە لەقورئان تیٚگەیشتین ئەبیٚتە هۆکاری خۆشەویستی و برایەتی وە دل لیٚك نزیك ئەکاتەوە و خیلاف نامیٚنی ، چونکە کە تیٚگەیشتین هەموومان یەك بەرنامە کۆمان دەکاتەوە ئەو کاتە ئەبین بەیەك دەست و بەیەك ئومەت وەکو هاوەڵەبەریٚزەکانمان لیٚ دیٚت .

بەلاٚم کاتیٚك ئەگەر لیٚ ی تیٚنەگەیشتین و خیلافمان دروست کرد لەقورئانەکەدا ئەو بلیٚ وا وا ئەویتر بلیٚ وا ئەویتر بلیٚ وا ،، بەکەیفی خۆی باسی کرد و چویەوە ناویەوە ئەوکاتە چەندەها حیزب و لایەن دروست دەبیٚ ، ئەوەتا بۆخۆتان ئەزانن لە دونیادا چەندەها حیزبی چی هەیە ؟ نالیٚن علمانی بەلکو ئەلیٚن ئیسلامی !! بەلاٚم ئەلیٚم بەناو ئیسلامی !.

ئەگەر تۆ حیزبی ئیسلامی ئەوە حیزب یەك حیزبە لەناو ئیسلامدا هەزار حیزبمان نیە کەسیش بەکەس رازی نیە وە کەس بەربەی کەس ناپیٚویی ! ئی واللە ی یان تۆ راستی یان تۆ راستی یان تۆ راستی یاخود هیچتان راست نین ، چونکە نابیٚ راستیەکان بریتی بن لە دووان وسیٚ یان بەلکو راست یەکە ، یەك و یەك ئەکاتە دوو ئەویتر ئەلیٚ سیٚ ئەکا ئەویتر ئەلیٚ چوار ئەکا هەمووشی ئەلیٚ موسلمانم واللە وانیە ، واللە یەك و یەك دەکاتە دوو ،

حەق یەکە (لایتعدد) خۆشەویستانم ئەگەر ئێمە بەتەواوی لەقورئانەکە تیٚ بگەین یەك ئومەت ئەبین وەکو پێغەمبەر و هاوەڵە بەرێزەکانی (صلی الله علیه وسلم)خیلاف هەبوو لەلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ؟.! هەر چیەکیان ئەوت ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەمە مانای چیە ؟! ئەی وت ئەمە ئاوایە ، بەس هەتا لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دوور کەوتینەتەوە هەتاوەکو ئێستا خیلافەکە زۆر بوو وە بەشە و حیزبەکان زۆر بوون ، تۆ هەر سەیری مێژووی ئیسلام بکە ئەوە (ئەشعەری و ماتوریدی و موفویضة و موجسیمە و موعتزیلە و جەهمی و جەبری ،،،) ئەمە لەناو موسلمانان لەکاتی خۆیدا کە دروست بووە گەورەترینیان کە بەناو شیعەیە ئەویتریان ئەهلی سونە .

ئێمە کە ئەلێن شیعە ئەوە یانی خۆشەویست و لاینگری ئالی بەیت بەلکو ئەوانەی ئێستا درۆ ئەکەن خۆشەویست و لاینگری ئالی بەیت نیە بەلکو دووژمنی ئالی بەیتن هەر بۆخۆیان لەعێراق حوسێنیان شەهید کرد ئەوەتا ئێستا لەخۆیان ئەدەن ئەلێن با گوناهەکەی ئەو کە کردومانە ئێمە لەخۆمان ئەدەین بۆ ئەوەی ببێتە کەفالەت وەکو یەهود بەلاٚم ناشبیٚ بەکەفالەتیان .

ئەها چی دروست بووە ١٤٠٠ ساڵە ئومەت ئەنالێنی بەم خیلافەوە ئێستاش هەیە یان نا ؟! رۆژێك ئەبینین لەرۆژان ئیران و ئەوانەی لەعێراق دەسەلات دارن چیمان لیٚ ئەکەن قتل و عامان ئەکەن ئەوە ئێستا رافیزەکان ئیعازیان دەر کردوە ، جا مەبەستەکەم لێرەدا ئەوە نیە بەشتێك مواجەهەی بکەین کە غەیری دینی الله تعالی بیٚ بەهەر چی شتێك تۆ مواجەهەی بکەی (واتا بەرامبەری بووەستیتەوە )تۆش زەرەر ئەکەیت بەلکو وەرە بەدینی الله تعالی مواجەهەیەی بکە وەرە کاتیٚ ئەچیتە بەرەنگاری لێی بلیٚ من موسلمانم و لا اله الا الله محمد رسول الله صلی الله علیه وسلم ، ئەمەوێی مێشکی ئێوە بێنمە خوارەوە کەکاتێك جوێن بە پێغەمبەر و هاوەڵە بەرێزەکانی ئەدەن بەهەموو هاوەلان ئەلێن کافر بەم قورئانە ئەلێن ئەو قورئانە نیە کە الله تعالی ناردویەتی ئەلێن جوبرائیل خیانەتی کرد لەجیاتی بۆ عەلی بێنی دای بە محمد (صلی الله علیه و اله وسلم )ژنەکانی پێغەمبەر هەمووی داوێن پیسن إلا خەدیجە نەبیٚ !!

ئەمە قسەی ئەوانە كیّ تان بەوە رازین !؟ ئەمە بەچی مواجەهە ئەكریّ !! إلا بەدینی الله تعالی دە والله ی بەدینی الله تعالی مواجەهەی بكە بەشەریان تێیا نیە ئازا بیّ هەمووی زەلیل و ترسنۆك رادەكا بۆیە بەدینی الله تعالی مواجەهەی بكە .

جا ئەگەر ئێمە تێبگەین ئەم خیلافە نامێنی و ئەبین بەیەك دەست و بەیەك دەولەت و بەیەك سەركردە وە یەك سەكردەمان ئەبێت ئەو كاتە .

سەیربكەن ئیبراهمی تمیمی شتێكمان بۆ دەگێڕێتەوە : ئەلێت : عومەری كوری خەتاب (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لیّ بێت) رۆژێك بەتەنها بیری ئەكردەوە (لا عمر بن الخطاب ذات یوم فجعل یحدث نفسه ، فأرسل إلی ابن عباس ، فقال : كیف تختلف هذه الأمة وكتابها واحد ونبیها واحد وقبلتها واحدة قال ابن عباس : یا أمیر المؤمنین إنا أنزل علینا القرآن ، فقرأناه وعلمنا فیما نزل ، وإنه یكون بعدنا أقوام یقرؤون القرآن لا یعرفون فیم نزل ، فیكون لكل قوم فیه رأی ، فإذا كان لكل قوم فیه رأی اختلفوا ، فإذا اختلفوا اقتتلوا)[٥٧] عومەری كوری خەتاب (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لیّ بێت رۆژێك بەتەنها داماوم بیری ئەكردەوە چۆن ئەبیّ ئەم ئومەتە بەرە و ئیختلاف و ئالۆزی و دووربەرەكی بروا لەكاتێكدا وەكو هەمووجاری ئێمە خۆمان ئەم قسەیە ئەكەین یەك خوامان هەیە و یەك ئیسلام و یەك پێغەمبەر و یەك قیبلەمان هەیە بۆچی ئەبیّ جیاوازی دروست بیّ ؟! ناردی بەدوای إبن عەباس دا چونكە إبن عەباس یەكێك بوو لە هاوەڵە بەرێزەكانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دوعای بۆ كردوە فەرموویەتی : یا الله لەقورئانی تیّ بگەیەنی ، یا الله لەدینی تیّ بگەیەنی ، ئیمامی عومەریش ئیعتامی ئەكردە سەری لەبەر ئەم دوعایەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چونكە ئەیزانی كەوا شارەزایە .

وتی وەرە إبن عەباس بزانم بابەتەكە چیە بۆ ئێمە واین ؟

إبن عەباس وتی : ئەی ئەمیری ئیمانداران دیارە ئەمە لەخەلافەتی خۆیدا بووە ، فەرمووی قورئان هاتە خوارەوە لەسەرمان خوێندمانەوە و تێگەیشتین بۆچی هاتۆتە خوارەوە ،

---

[٥٧] : حیاة الصحابة ١-٣ ج٣،،ص٩٠

تێگەیشتین کە یەکخواپەرستی مەبەستە ، تێی گەیشتین کەوا دەبێ هەموومان بەندەی الله تعالی بین ئێمە تێی گەیشتین بۆیە الحمدلله ئێمە یەك بووین ، بەڵام لەدوای ئێمە قەومانێك و کەسانێك دێن قورئانەکە دەخوێنەوە و نازانن بۆچی هاتۆتە خوارەوە نازانن لەبەرچی ئەم قورئانە هاتۆتە خوارەوە ، ئەو کاتە ئەو دەڵێ ئەمە مانای ئەوەیە ئەویتر ئەڵێ ئەوە مانای ئەوەیە لێی تێ ناگەن چۆن صەحابە و تابعین لێی تێگەیشتن ئاوا لێی تێناگەن بەکەیفی خۆیان لێکی ئەدەنەوە ،

(ئێستا گوێمان لێی یە لەسەرکردە بەناو حیزبە ئیسلامیەکان ئەڵێ : تێگەیشتنی قورئان و حەدیس مولکی کەس نیە ئێمەش بۆمان هەیە چۆنی بمانەوێی تێبگەین !! ) منیش ئەڵێن نەوالله من تێگەیشتنی تۆم بە فلسێك ناوێی !! بەلکو برۆ وەکو هاوەڵان تێگەیشتوون ئاوا تێی بگە ، هاوەڵەکان کاتێك کە لەقورئان تێگەیشتن ئەیانوت ئەبێ عیزت بۆ الله و بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و بۆ موسلمانان بێ نابێ عیزت بۆ موشریك بێ کەچی جەنابت ئەڵێ نەخێر ئاساییە با کابرا جوێنیش بدا بە خوا و بە پێغەمبەر ئەوە برای منە ئاساییە ! دێن تەئویلی ئایەتەکان ئەکا (أَخَاهُمْ هُودًا)[58] ئەڵێ برامە ، برا شەیطان پەرستەکەم برا عەرەق خۆرەکەم !! ئایا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) و ئەصحاب وتیان براکەم ئەبو جەهل !!؟ نەی وت موشریك موشرکە و پیسە الله تعالی دەفەرمووی : (إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ)[59] پیسن و گلاون تۆ ئەبێ ئاوا مامەلەی لەگەل دا بکەیت ئەوکاتە تەنها ئومەتی ئیسلام ئەیباتەوە بەس کە تۆ وتت برای بەرێزم کاك ئەبو جەهل و برای بەرێزم کاك شەیطان و برای بەرێزم کاك فیرعەون !! ئیتر تەواو هەموو شتەکان تێك چوون تۆ ئاوا بۆم تێی ئەگەیت !؟! ئەوە ترسنۆکییە ئەوە (حب الدنيا، وكراهية الموت)[60] ئەوە عیزەت نیە کە تۆ هەتە ، پێغەمبەری خوا( صلی الله علیه وسلم) بەمە رازی نەدەبوو وە نان و کەبابی لەگەڵ ئەبو جەهل دا نەئەخوارد !!

[58]: سورة الأعراف اية : ٦٥
[59]: سورة التوبة اية : ٢٨
[60]: أخرجه أبو داود في سننه (٢/ ١٠ ٢)

بەلكو پێی دەوت : ئەبو جەهل سەرکردەیەکی گەورەی قوریش بوو ناوی خۆی بریتی بوو لە (عەمری کوری هیشام )کونیەی خۆی بە (ابو الحکم) دەکردبوو بەس پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی وت (ابو جهل )ە نەك (ابو الحکم)دەی بزانم ئەبوالحکەمەکانی ئەمرۆ تۆ پێیان ئەلێ برای بەرێزم !! پێی نالێی ئەبو جەهل بەلکو دەلێ برای بەرێزم وەرە دانیشین ! پیرۆزبای لەشیوعیەکان دەکا دەلێ سالیادی حیزبەکەتان پیرۆز بێ یانی کە دەلێ خوا نیە دەلێ پیرۆزمان بێ ئەو قسەیەی کە تۆ ئەیکەیت ئەچێ بۆلای نەصرانیەکان کە ئەلێ عیسا کوری خوایە ئەلێ پیرۆزت بێ سەری سالت پیرۆز بێ تۆ راست دەکەی خوا درۆیی کرد کە ئەلێ عیسا صەلب نەکراوە بەلێ عیسا صەلب کراوە و جەنابت راست دەکەی !! دەبێ ئێمە پێکەوە ژیان بکەین ئیترخوا بەدرۆ ئەخرێتەوە کێشە نیە پێغەمبەر بەدرۆ ئەخرێتەوە (صلی الله علیه وسلم) کێشە نیە !!

ئەی بەم شێوە نیە خۆشەویستانم ئەمرۆ ! من ئەم فهم و تێگەیشتنە سەقەتی تۆم بۆچیە ، بەناوی چیەوە ئەم قسانە ئەکەن بەناوی ئیسلامەوە .

پێنجەم : ئەو کەسەی کە عیلم دوور بکەوێتەوە و لەقورئان دوور بکەوێتەوە الله تعالی موبتەلای ئەکات بەشتێکیترەوە ، الله تعالی موبتەلەلای ئەکات بەشتێکیترەوە کە ماڵ ویرانی دونیا و قیامەت رووی تێ ئەکات .

سەیرکەن ، الله تعالی لەبارەی یەهودەوە دەفەرمووی : (وَلَمَّا جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ) یەهودیەکانی بەنی قوریظە و بەنی نضیر و بەنی قینقاع لەناو مەدینە کە الله تعالی پێغەمبەر محمد(صلی الله علیه وسلم)ی نارد و کردی بە پێغەمبەر لەناویاندا وە قورئانی بۆ هات ئەبوایە ئەوان تەسلیم بوونایە (وَلَمَّا جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ) بەمەرجێك ئەم قورئانە تەصدیقی قورئان و ئینجیلی کردوە تصدیقی عیسا و موسای کردوە نەی وتوە من تۆ بەهیچ نازانم تۆ ئەصل و فەصلت نیە وای نەوتوە بەلکو وتویەتی بەلی عیسا و موسا پێغەمبەر بوون وە تەوارت و ئینجیل هەبوون ، بەلاّم تەواو لێرە تۆ ئەبێ ئێستا شوێن من بکەویی نابێ شوێن هیچتر بکەوی ئەگەرعیسا و موسا لەژیاندا بونایە نابێت شوێنیان بکەوێی بەلکو ئەبێ

شوێن من بکەویی (مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ)کە ئەمەی وت (نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ كِتَابَ اللَّهِ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ)[٦١] ئەهلی کیتاب چیان کرد لە یەهود و نەصارا ؟! قورئانیان خستە پشت خۆیان هەر گوێشیان پێی نەدا وازیان لەقورئانەکەی الله تعالی هێنا ، بەلاّم کەوازیان لیٚ هێنا توشی چی بوون ؟!

سەیری ئایەتەکە ئەلیٚ : (كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ)هەروەکو ئەوە وایە کە ئەوەیان نەزانیبێی کە الله تعالی پێی وتون لە تەورات و ئینجیلدا کە الله تعالی پێغەمبەرێك و قورئانێك ئەنێرێی ئێوە شوێنی بکەون .

ئەی شوێن چی کەوتن کەوازیان هێنا ؟ (وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُو الشَّيَاطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَانَ ۖ)[٦٢] شوێن سیحر بازی کەوتن کیتابی سیحر موبتەلا بوون بەمەوە دیراسەی سیحریان کردو پێی کافربوون .

ئێستاش ئێمە وازمان لەقورئان هێناوە موبتەلای چی بووین ؟! برۆ بزانە داروین چی وت ؟ برۆ بزانە مارکس چی وت ؟ برۆ بزانە لینین چی وت ؟! برۆ بزانە فەیلەسوفەکانی ئیغریقی و یۆنانی و رۆمانیەکان چیان وتوە !؟ بزانە دیموکراتیەت چیە برۆ با خەلك یاسامان بۆ دابنێن با ئەو خەلکە دابنێی یاسا ئێمە خوامان بۆ چیە یاسامان بۆ دابنێی بەلکو دەبیٚ خەلك بۆ ئێمە دابنیٚ خوا نەیزانیوە ئێمە چیمان دەوێی و چین ، هەروەکو سامیری وتی : موسا لەبیری چوو کە ئەم عیجلە خوای ئێمەیە چووە لەکێوی طور خوای خۆی بدۆزێتەوە ئەمە خوای ئێمەیە !! ئەمرۆش ئەم خەلکە وای لێهاتوە لەمەجلیسی پەرلەمان کۆ دەبێتەوە ئاگای لەخوا نیە و سوێن ئەخوا ئەلیٚ ئەبیٚ من موحافەزە بکەم لەو قسەی کە خەلك دەیکا خوا چی دەلیٚ با بۆخۆی بیلیٚ !!

ئەمە گەورە نیە خۆشەویستانم ئەم قسەیە ! موبتەلای نەکردن بە رەئی گەلەوە ، کێین ئەوانەی کە دائەنیشن لەقورئان و حەدیس و شەریعەتی الله تعالی شارەزان !! (صلی الله علیه

[٦١] :سورة البقرة اية :١٠١
[٦٢] :سورة البقرة اية :١٠٢

وسلم)!! ئەمە حەقیقەت نیە !؟ ئێمە ئێستا موبەتەلا بووین بەچیەوە !؟ ئەبێ کەسانێك بێن بەکەیفی خۆیان دەستوورمان بۆ دابنێن ، کاکە من دەستوری تۆم ناوێی بەلکو دەستوری الله تعالی م دەوێی ، مادەم تۆ وابیت من تا سەرئیسقان لەگەلت دا نیمە و تەواو من سەوتیشت بۆ نادەم سەوت نادەم بەکەسێك کەوا قورئانی الله تعالی فرێی بدا و بێت قسەی خەلکیم بۆ بخاتە سەری !! ئەوانەی لەپەرلەمانن دەلێن : (سوێند بێت بەخوای مەزن من پارێزگاری لەم یاسایە بکەم کە خەلك دایئەنێی )!! قورئان بەجێی ئەهێلن ئەلێن نامانەوێی بۆچیمانە .

جا الله تعالی موبەتلات ئەکا بەمەوە باش ئاگاداربە تۆ قورئانت بەجێهێشت الله تعالی موبتەلات ئەکا بەرەئی خۆت بە ئەهوا و ئارەزویی خۆت ، لەسەر هەواو ئارەزویی خۆت دونیا ئەکوژی خواش جوێنی پێی ئەدرێی و قورئانی فرێی ئەدرێی و شەقی تیَ هەلئەدرێی کێشە نیە هەرکەس دینی خۆی بۆخۆی و هەرکەس قەبری خۆی بۆخۆی وا ئەلێن !! بەس بەقسەی من نەکەی پارچە پارچەت ئەکەم !! ئەلێن کەس لەیاسا گەورەتر نیە !! یانی خواش لە یاساکەی من گەورەتر نیە !!! ئاگاداربن ئەمە رێگەی یەهودە ،

وە بالفعل ئەمە یەهود و نەصرانیەکان ئەمەیان بۆ ئێمە دانا ، لە فەرەنسا لە سالەکانی ۱۷۰۰ەکان کە مەلەبەندی عەلمانیەتە ئەم فەرەنسایە هەلسان وتیان کەنیسە و پاپا و قشەمان ناوێی با شەقێکیان تێی هەلبدەین دینمان بۆچیە دێن پەرلەمان دائەنێن لەوەێوە پەرلەمان داهات ، پەرلەمان یانی موناقەشە ، یانی لەناو ئەو هۆلەدا هەمووشتێك قابیلی موناقەشەیە خواش قسە بکا قابیلی موناقەشەیە بۆیە ئێستا دەیان بینی ئێستا ئاوەهان دین نیە خەلك خوایە لایان ، خواش خراوەتە پشتەوە (كِتَابَ اللَّهِ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ).

باشە یەهود نەیدەزانی کەوا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) حەقە ؟ بەری والله تعالی دەفەرمووی : وەکو مندالەکانی خۆیان چۆن لەخێزانیان بووە والله ئا ئەوها ئەیانزانی کە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم )عەبد و رسولی الله تعالی یە ئەیانوت تا سەر ئیسقان ئێمە موخالەفەی ئەکەین چونکە لەئێمە نیە لە بەنی یەعقوب نیە چونکە لەبەنی إسماعیلە حەسەد ئەوانی گرت هەروەکو چۆن شەیطان حەسەد گرتی بۆ ئەبێ سەجدە بۆ ئادەم بەرم والله نایبەم

خستیه جەهەنەم ، یانی ئێوە خۆشەویستانم بیربکەنەوە لە شەیطان حەقیقەتەکە هەمووی ئەزانی واللە هیچی لێ خافی و شاراوە نیە کەچی سەیر ئەکەی خۆی توشی جەهەنەمێك کردوە ، ئەزانی وەکو چی وایە ؟ وەکو ئەوە وایە بلێ کاکە ئەمە چیە ؟ بلێ ئەوە دارە ! بلێ ئەوە عەینەکە ئەلێ نەواللە ئاخر ئەت خەمە جەهەنەم ئەلێ بمەخەرە جەهەنەم هەر دارە وا ئەلێ ! ! ئەلێ بمخەرە جەهەنەم هەر دارە ! ئەشی خاتە جەهەنەم و ئەیسوتێنی ئیقرار ناکا بەس لەناخی خۆی ئەزانی کە ئەو هەلەیە !

ئەم خەلکەش وایە ئەمرۆ .

لەهەریەکێك لەخۆمان بپرسین لەموسلمانان بپرسین دەربارەی قورئانی پیرۆز هەر هەمووی ئەوەی بەگوێی کەوتوە کە ئەم کیتابە کیتابی هیدایەتە ، کیتابی رێپی نیشاندانە بەرەو راستی وە دوور کەوتنەوەیە لەناحەقی و باطل وە دوورکەوتنەوە لەغەیری اللە تعالی وە نزیك کەوتنەوە و رۆیشتن بەرە و لای اللە .

ئەم قورئانە پیرۆزە ئەمرۆ یەکێك لە سورەتەکانی باس دەکەین دیراسەی سورەتەکە دەکەین ناچین لەیەکەمەوە تاوەکو کۆتایی خالْ بەخالْ ئایەتەکان تەفسیر بکەین چونکە کاتی دەوێی بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی ئەمەوێت سەرنجتان بۆ ئەوە رابکێشم کە تۆی موسلمان کە ئەچیت قورئان ئەخوێنی ئیسلوبت لەقورئان خوێندن چۆن بێت بۆ ئەوەی تامی لێ بکەیت !

خۆشەویستانم هەر ئەوەندە نیە قورئانەکە بکەینەوە بلێت خەتمێکم کرد ! تەواوم کرد دواتریش بلێ چی وت ؟ بلێ واللە نازانم چی دەلێ ! ئەمە کێشەیە ! تۆ وەرە سورەت بە سورەت لەسەرەتاوە لەم سەر تا ئەم سەری سەیر بکە لێت بپرسمەوە بلێم ئەم سورەتە باسی چی کرد پێم بلێت و بۆم کورت بکەیتەوە خالْ بەخالْ بلێ ئەم سورەتە بەرێزە باسی ئەمە و ئەوە و ئەمە دەکا دیراسەی بکەیت و دواتر بچێتە سەر سورەتێکیتر بەهەمان شێوەیە .

ئەم بابەتە لەلای زانایان بەش کردنی قورئان و تەجزییە کردنی واتا بەجۆ جۆ کردنی قورئان ئەگەر ئێمە سەرنجی بدەین لەم قورئانانەی کەوا لەبەردەماندایە بەشێوەیەك تەجزییە کراوە

جۆ جۆ کراوە کە زانایانی محقیقین لیٚ رازی نین ! ! ئینجا لەوانەیە تۆ پرسیارت هەبیٚ بلیٚ لەچی رازی نین ؟! چونکە نازانی تجزییە یانی چی یان ئەزانی بەس نازانی لەکوێی وە ئەم جۆ جۆ ی قورئانە هاتوە ؟!

ئەلێن ئەم شێوازەی کە ئەلێن : جۆ ی یەك تا ئەوێی یە جۆ ی دوو تا ئەوێی یە ، جۆ ی سیٚ یەم تا ئەوێی یە،،، قورئان کراوە بەسی جۆ ەوە ئەمە (حجاجی کوری یوسفی ثقفي ) هێناویەتی کەزانایانی محقیقین وەکو شێخ الاسلام ابن تیمیە بەم تجۆ یە رازی نیە ئەلیٚ قورئان قەگع ئەبیٚ تۆ سەیر دەکەی لەجۆ ئەکاندا ئەگەر سەیر بکەی جۆ ێك بەبیٚ بەقرە چونکە بەقەرە درێژترین سورەتی قورئانە حەتمەن تۆ بەیەك رۆژ بۆت نەخوێندرێتەوە ئەگەر تجزییە بکەی بەسیٚ بەشەوە بشزانی ئەم سی یە لەکوێی هاتوە ئەوەش باس دەکەین إن شاء الله ، ئەوە إلا دەبیٚ بەچەند بەشێکەوە ئەگەر نەبیٚ بەسیٚ بەش ئەبیٚ بەدوو بەشەوە سورەتی البقرة بەلاٌم باقیتری سورەتەکانی قورئان تجزییە مەکە ،

بۆنمونە ئەمرۆ حۆ ی ئەمرۆمان کە البقرة دەخوێنین البقرة ئەکەین بە دوو بەشەوە یان بەسیٚ بەشەوە بۆ نمونە بەشی یەکەم هەتا ئایەتی ئەوەندە بەشی دووەم هەتاوەکو ئایەتی ئەوەندە بەشی سیٚ یەمیش هەتاوەکو کۆتایی ئەمەتەواو ، لەدوای ئەوە هەموو رۆژێك سەیر دەکەی ال عمران دەخوێنی بەکاملی بۆ ئەوەی لەسورەتەکە تیٚ بگەی دوای ئەوە سورەتی النساء دوای ئەوە سورەتێکیتر ئیتر تا کۆتایی بەلاٌم جاری وایە لەبەر ئەوەی سورەتەکان کەمن چەن سورەتێك دەخەیتە پالٌ یەك بۆ ئەوەی ببێتە جۆ ی ئەمرۆژە واتا لەناوەندی سورەتەکە سورەتەکە قەطع مەکە ئەورۆژە ،

زانایان دەفەرموون : بابەتی بە سی جۆ کردنی قورئان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) بە عبدالله کوری عەمری کوری عاصی فەرموو : تۆ قورئان هەموو رۆژێك دەخوێنیتەوە و وامەکە لە بەلکو لەمانگێکدا خەتمێك بکە ، یانی ئەگەر ئەم مانگە لێك بدەینەوە قورئان بەمانگێك تەقسیم بکەین ئەبیٚ بەچەند بەشەوە ئەو کاتە ئەبێت یان ٢٩ یاخود ٣٠ چونکە

مانگی هیجری یان ٢٩ یان ٣٠ ییه پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : (اقْرَإِ الْقُرْآنَ فِی كُلِّ شَهْرٍ)[٦٣] .

كەواتە تۆ بەم شێوازە بەشەكانی قورئان لەلای خۆت بەش بەش بكە پاشان وەرە هەر بەشێك لەو بەشانە دیراسە بكە ، ئەمرۆ ئێستا ئسلوبێكتان فێر ئەكەم بۆ ئەوەی تام و چێژ لەم قورئان بكەی لەو بەشەی كە ئەمرۆژە دەیخوێنیت .

نمونە دامان نا ئەمرۆ سورەتی الكهف دەخوێنینەوە !

سورەتی الكهف یەكێك لەو سورەتانەی زۆربەی زۆرتان الحمدلله جومعان ئەخوێنەوە چونكە حەدیسی لەسەرە چەند حەدیثێكمان هەیە بۆ نمونە  یەكێك لە ریوایەتەكان دەفەرمووی : ئەوەی رۆژی جومعە  سورەتی الكهف بخوێنێتەوە لەنێوان ئەو جومعە و جومعەیەتردا ئەو عەمەلە صالحەی وەكو نورێك لەئاسمان دەردەكەوێ ، یان لەشەوی جومعە یانی ئەو شەوەی بۆ بەیانیەكەی جومعەیە یان لەرۆژی جومعە چونكە شەو لەپێش رۆژە لە مانگی هیجری ئەمە ئاگاداربە ئەمە كە مەغریب هات ئەمرۆ چەن شەمەیە ؟ پێنجە بەیانی  كەواتە ئەم شەوی چ شەوێكە ؟ شەوی جومعەیە لەلای كافران شەوی پێنج شەمەیە لەلای كافران رۆژ لەپێش شەودایە ئەلێن رۆژ ئینجا شەو بەلاّم لەلای ئێمەی موسلمان ئەلێن شەو ئینجا رۆژ الله تعالی دەفەرمووی : (وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا)[٦٤] شەو و رۆژمان گێراوە بەدوای یەكدا بۆ ئەوەی كە لەشەودا عیبادەتی شەوت لەدەست دەرچوو لەرۆژ بیكەی وە لەرۆژ دەرچوو لەشەو بیكەی .

ئینجا ئەم شەو و رۆژە ئەوەی كە دێ شەوی جومعەیە واتا لەمەغریبەوە هەتا بانگی بەیانی شەوی جومعەیە ئالێرەدا سورەتەكە دەخوێنی لەهەر كاتێكدا یان لەریوایەتیتر داهاتووە لە رۆژدا ، وە هەندێك لە ئەهلی عیلم ئەلێن : ئەم دوو ریوایەتەیان بەلاوە صەحیح نیە بەلاّم ئەلێن لەو هەفتەیەدا هاتوە نەك تعین كردنی شەوی جومعە و رۆژی جومعە ئەمەشیان قەولێكە لەلای

[٦٣] : رواه البخاري (٥٠٥٢) تحت باب " في كم يقرأ القرآن "
[٦٤] :سورة الفرقان اية : ٦٢

زانایانی حەدیث دەفەرموون لەناو جومعەکەدا واتا نابێ لەسەر تۆ تێپەرکا وەکو سونەتێك إلا دەبێ لەخیلالی هەفتەیەکدا تۆ سورەتی الکهف بخوێنیتەوە هەموو هەفتەیەك جارێك بیخوێنیتەوە.

ئەم گرینگی دانە بۆ ؟! با بێنە ناو سورەتەکە سورەتەکەتان پێ ئەناسێنم !!:

الکهف : یانی ئەشکەوت ، ئەمە لەچیەوە هاتوە ؟ سورەتێکە باس لە چەن گەنجێك دەکا کە لەبەر خاتری الله تعالی کە تەنها الله تعالی یان ویستوە کەسیتریان نەویستوە حاکمی ئەو زەمانە ویستویەتی شیرکیان پێ بکا ، بەلاّم ئەوان وتویانە : بەمە رازی نابین و هەلاتوون لەدەستی ،(سَيَقُولُونَ ثَلَاثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًا بِالْغَيْبِ ۖ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ۚ)[٦٥] هەندێك دەلێن سێ کەس بوون بە سەگەکەیانەوە چوار هەندێك دەلێن پێنج بوون بەسەگەکەیانەوە شەش وە هەندێکیتر دەلێن حەوت بوون بەسەگەکەیانەوە هەشت یانی سەرجەمی ژمارەکە لە حەوت کەس تێپەر ناکا ئەویش کەس نازانی چەند بوونە إلا الله تعالی نەبێ ، گرینگ چەند گەنجێك بوون قوربانیان دا لەپێناوی دینەکەیان شارا و ولات و هەموو شتێکیان بەجێهێشت !

وتیان : شیرك بکەین ؟! غەیری الله تعالی بپەرستین ؟! (وَإِذِ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ)[٦٦] ئێمە بچین شیرك بکەین ؟! نەخێر بەلّکو تەنها الله تعالی ئەپەرستین تەنها الله تعالی و هیچتر نا نەباوك نەدایك نەعەشیرەت نە کور نە دار نەبەرد نە خۆر نەزیندوو نەمردوو نە بەرنامە نە پێغەمبەران نەملائیکە نەهیچ کەسێك إلا الله تعالی نەبێ پەرستن بۆ ئەمانە قەدەغەیە تەنها الله ،

هەلسان و قوربانیان بەمە دا رۆیشتن و ولاتیان بەجێهێشت رویان کەوتە ئەشکەوتێك سەیری کەرامەت بکەن کە ئێمەی موسلمان ئیمانمان بە کەرامەتی پیاوچاکان هەیە بەلاّم کەرامەتێکی دروست نەك درۆیینە موسم بۆ دەخوا و ئاگرم بۆدەخوا ئەلێ من کەرامەتم هەیە ئەوە

---

[٦٥] :سورة الكهف اية :٢٢
[٦٦] :سورة الكهف اية : ١٦

شەیطانیە نەك كەرامەت لەژیانیدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەی وتوە ئێوە ئاوا بكەن ، هاتن چونە ناو ئەشكەوتێك لە ئەشكەوتەكەدا الله تعالی یارمەتی دان و خەویان لێ كەوت ٣٠٩ساڵ تۆ بیری لێ بكەرەوە و بەسەریدا تێپەر مەكە !! كەسێك ٣٠٩ ساڵ ئەخەوێی لەئەماندا الله تعالی ئەیژێنی و ناشهێلی برزی ئەمە كەرامەت نیە !؟ جا ئەمە بۆپیاو چاكان ئەوترێی كەرامەت بەس ئەگەر بۆ پێغەمبەران بوو پێیان ئەوترێی موعجیزە هەردووكیان جیاوازن ، ئەمە كەرامەتی پیاوچاكانە .

هەروەكو مەریەم الله تعالی رێزی لێ نا خۆ پێغەمبەر نەبوو كەرامەتی پێدا و خواردنی بۆ هێنایە خوارەوە ، زەكەریای پێغەمبەر (علیهم الصلاة والسلام) ئەی وت لەكوێی بۆت هات ئەمە ئەی مەریەم ؟! ئەی وت الله تعالی ناردویەتی ، ئەبێ ئیمانمان بەمانە هەبێ كەرامەتی پیاوچاكان لەسەر سەرمان ، بەلاّم كەسانێك جادو گەر و سیحر بازن باسی ئەوەم بۆ بكا فلان شت دەكا و فلان شت دەكا و غەیب دەزانێ !! ئێمەش دەلێن درۆ دەكەیت نابێ كەسانێك لەو رێگەیەوە بێنە ناو مانەوە .

سورەتی الكهف سورەتی قوربانی دانە بەعقیدەكەت ئەوەیە كە تۆ ئەیخوێنیتەوە هەموو هەفتەیەك و بەردەوام الله تعالی عقیدەت بیردەخاتەوە ئەمانە دوای ٣٠٩ ساڵ خەبەریان بوویەوە بەتەفاصیل باسی ناكەم تەنها ئاماژەی پێ دەكەم الله تعالی رزگاری كردن لەدەست دەست و دائیرە و زالمەكانی ئەو زەمانە بەلاّم ئەو زەمانی ئەوانی تێكەوتن رێزیان لێنان بەلاّم رێزلێنانەكەشیان هەلەی تێدا بوو الله تعالی بۆمان باس دەكا هەندێك وتیان والله مزگەوتیان بەسەرەوە دروست دەكەین ! پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : لەعنەتی الله تعالی لەسەر یەهود و نەصارا كە مزگەوت بەسەر قەبردا دروست دەكەن ، نابێ تۆ بلێ والله لەسورەتە كەدا باسی ئەوە دەكا ئەوە مزگەوت لەسەر قەبر دروستە ، نەخێر ئەوە ئیشی ئەوان بوو و هەلەیان كرد .

سورەتی الكهف یەكێكە لەو پێنج سورەتی لەقورئاندا كەوا بە (الحمدلله) دەست پێ دەكا تۆ لەقورئاندا پێنج سورەتت هەیە كەوا بە (الحمدلله) دەست پێ دەكا ئەمانەن :

١–سورەتی الفاتحة : الله تعالی دەفەرمووی : (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)[٦٧] تۆ فێر ئەكرێی كەوا تەنها سوپاسی الله تعالی بكەیت ، بزانم هەركەسێك چاكەیەكت لەگەلدا بكا هەتا چەن سالێك هەر خۆتی بۆ دائەنوێنی كە دروستیش نیە هەر دەلێ سوپاس قوربان ئەم خۆ چەماندنەوە دروست نیە كەچی بۆشی ئەكەیت ئەوەندە بەسە كەوا بلێت سوپاست دەكەم چونكە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : (مَنْ لَمْ يشْكُر النَّاسَ لَمْ يشْكُر الله»)[٦٨] ئەوەی سوپاسی خەلكی نەكات لەبەرامبەر ئەو چاكەیەی كە لەگەلیدا دەیكا سوپاسی الله تعالشی نەكردوە ، كەواتە دەبێ سوپاسی ئەم خەلكە بكەی بەس نابێ ئەم خەلكە داوای سوپاست لێ بكا ، یانی من كە چاكەیەك لەگەل تۆ دەكەم من نابێ تەكبور لەگەل تۆدا بكەم و باسی بكەم بۆم نیە (لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا)[٦٩] بەس تۆ ئەدەب وایە بەمن بلێ سوپاس (مَنْ لَمْ يشْكُر النَّاسَ لَمْ يشْكُر الله»)شوكری الله تعالی نەكرد ئەو كەسەی كەوا شوكر وسوپاس ئەو كەسەی نەكرد كەوا چاكەیەكی لەگەلدا كردوە ، ئینجا من مەبەستەكەم ئەوەیە كە تۆ چاكەیەكت لەگەل دا دەكری تا دەسالێتر دەیخوێنیتەوە و ئەلێ فلان كەس ئەو چاكەیەی لەگەلدا كردم ، ئەی الله تعالی هەمو كاتێك و لەحزەیەك چاكە لەگەل تۆ دا دەكا بلێ الحمدلله ، لەسورەتی الفاتحە دەفەرمووی (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)[٧٠] سوپاس بۆ داهێنەری هەموو بونەوەر و دروستكاری هەموو بونەوەر و بەرێوە بەری هەموو بونەوەر هەموو بونەوەر ئەژێنی ئەگەر الله تعالی یەك لەحزە و سات واز لەئێمە بێنی ئێمە تیا دەچین سوپاسی ئەكەین كەواتە .

٢– سورەتی الانعام : الله تعالی دەفەرمووی : (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ۖ ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ)[٧١] سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە ئاسمانەكان و زەوی دروست كرد سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە تاریكایی لەگەل نور دروست كرد ، جا لێرەدا تاریكایی دوو بەشە (مادی و مەعنەوی) نوریش بەهەمان شێوە (مادی و

---

[٦٧] :سورة الفاتحة اية :٢
[٦٨] : وورد في رواية الترمذي عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم .
[٦٩] :سورة الانسان اية :٩
[٧٠] :سورة الفاتحة اية :٢
[٧١] :سورة الأنعام اية :١

مەعنەوی) هەیە سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەوا رۆژی دروست کردوە و بەردەوام شەو نیە وە سوپاس بۆ ئەو خوایە کە دینی ئیسلامی دانا تاریکایی وریبازە پوچەلەکانیتری لیّ دروخستینەوە الحمدلله (الظُّلُمَاتِ)تاریکای بەرجەستە وە تاریکایی ریّبازیشە ئەلیّ (الظُّلُمَاتِ)بەجمع دەیهیّنی بەکۆ ، ئەلیّ تاریکایەکان ، الله تعالی تاریکایی داناوە بەس بەتۆ ئەلیّ لەتاریکایەکاندا مەرۆ لەریّگەی تاریکایی مەبەستی لە ریّبازە پوچەلەکانە بەس الله تعالی دەفەرمووی : (وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ۖ)نوریش ئەم قورئانەیە (ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ)دواتر کافرەکان ئەچن شەریك بۆ الله تعالی قەرار ئەدەن ، الله تعالی یەك ریّبازی داناوە ئەویش ئەلیّ نا ئەو ریّبازەم ناویّی ئەویترم ئەویّی، ئەوە شەریك پەیا کردنە بۆ الله تعالی هەزار نویّژ و رۆژوو بکەی لیّت قبول ناکریّی لەبەر ئەوەی تۆ ریّبازیّکیترت گرتۆتە بەر .

٣-سورەتی الکهف : سەیری بکەن چۆن دەست پیّ دەکاتن دوو خالی زۆر ئەساس باس دەکا الله تعالی لەم سورەتەدا لە سەرەتاکەی الله تعالی دەفەرموی : (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ الْكِتَابَ)[٧٢] الله تعالی لەم ئایەتەدا عەبد و کیتاب باس دەکا ، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەوا ناردیە خوارەوە کیتاب بۆ سەر بەندە و عەبدەکەی ئەم قورئانە بۆ سەر محمد (صلی الله علیە وسلم) ئیّمە ئەبیّ سوپاسی بکەین کەوا ئیّمەی بەجیّ نەهیّشت کەوا لەتاریکایی بیّ عەقلیدا برۆین ، ئەبیّ سوپاسی بکەین کە ریّگەی راستی بۆداناین ، ئەگەر الله تعالی نەبوایە ئەتزانی تۆ لەئادەم و حەوایت ؟! ئەگەر الله تعالی نەبوایە ئەتزانی بەرەو کویّی ئەرۆیی !؟ سەرت لیّ ئەشیّواو و مال ویّران ئەبووی ئیّستاش کە ئەو ریّبازەی پیشان داویی تۆ لەئادەم و حەوا هاتووی ئەبیّ بەرەو بەهەشت برۆیتەوە ئەگەر بەقسەم بکەی وە ئەگەر بەقسەم نەکەیت بۆ جەهەنەم ئەچیت تەواو کەواتە : (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ الْكِتَابَ)سوپاس بۆ ئەو الله تعالی یە کە ناردییە خوارەوە بۆ بەندە و عەبدەکەی ئەم کیتابە (وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجًا ۜ)[٧٣] ئەم کیتابە خوار و خیّچی تیّدا نیە و ریّگەی هەمووی دروستە (قَيِّمًا)[٧٤]راستە ، زانایان دەفەرموون : ئەمە تقدیم و تأخیرە واتا (قَيِّمًا ئینجا وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجًا ۜ)بەلاّم ئەوها

[٧٢]:سورة الکهف ایة : ١
[٧٣]:سورة الکهف ایة : ١
[٧٤]:سورة الکهف ایة :٢

هاتووه هەركامێك بێ الله تعالی پێمان ئەڵێ لەسەرەتا سوپاسی ئەو خوایە بكەن كە ئەو كیتابەی نارده خوارەوە بۆسەر بەندەكەی وە هیچ خوار و خێچێكی تێدا نیە و ئەحكامەكانی هەمووی دروستە ، هەی قوربەسەر ئەو كەسەی كەوا نەقد لە خوا ئەگری و ئەڵێ : ئەك كتێبە ئەبێ تعدیل بكرێ ئەبێ چاوی بەسەردا بخشێنینەوە و ئەبێ بەفەهمی خۆمان وەریبگرین بەفەهمی صەحابە وەرینەگرین ،یاخود رێبازێكیتر دانێن و ئەوە فرێ دەن ئەمە بەكلكی ئەمرۆ نایە الله تعالی دەفەرمووی : (وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجًا ۜ)رێبازەكانی ئینسانەكان هەمووی عیوەجی تێدایە یانی خواری واتا خواری و خێچی و نەهامەتی و قوربەسەریی دواتر الله تعالی دەفەرمووی: (قَيِّمًا)رێگاكە راستە هەموو ئەحكامەكانی دروست و راستە لە تەوحید و لە تەحیكم و لەئیمان وە لەئەخلاق و سلوكی جوان !.

بۆچی ئەمەی ناردوە الله تعالی ؟! ئەمە غایە و ئامانجەكەیەتی : (قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا (٢) مَّاكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا (٣) وَيُنذِرَ الَّذِينَ قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا (٤))[٧٥] الله تعالی ئەفەرمووی : بۆ ئەوەی عەزابی الله تعالی تان نیشان بدا بۆ ئەو كەسەی كە دەستی پێوە نەگرێت (لِّيُنذِرَ)بتان ترسێنی بەعەزابێك بۆ ئەو كەسەی كەوا دەستی پێوە ناگرێ (لِّيُنذِرَ)بەلاّم چی ئینزارێك و چ ترسێك (بَأْسًا شَدِيدًا) عەزابێكی زۆر شەدید و قورس بۆ ئەو كەسەی كەوا دەستی پێوە ناگرێ .

(وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ) ئەی ئەوانەی كەوا دەستی پێوە دەگرن ؟ ئەوانەی كەوا دەستی پێوە دەگرن الله تعالی موژدەیان پێ ئەداتێ بە بەهەشت و لێبوردنی خۆیی مادەم عەمەلی صالح دەكەن (أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا)ئەجرێكی زۆر چاك و رێك وپێكیان ئەداتێ(مَّاكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا) هەتا هەتاییە تێدا ئەمێنەوە و نامرن و و نەخۆش ناكەون و خەم و خەفەت ی تێدا نیە گەنج بە و بخۆ و بخۆرەوە بەبێ كەوا مەنعت لێ بكرێ ( وَيُنذِرَ الَّذِينَ قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا) بۆ ئەوەی ئەوانەش بترسێنی ئەو نەصرانی و گاورانەی كەوا ئێستا زۆرینەی سەر زەوی پێك دەهێنن كە ئەڵێن خوا كوری هەیە و عیسایە ! الله بیان ترسێنی

[٧٥] :سورة الكهف

بەوەی کەوا الله تعالى کوری نیە ئێوە بۆ جەهەنەمن بە هەتا هەتایی ، ئەمە سەرەتایی سورەتی الکهفه .

٤–سورەتی سبإ : الله تعالى دەفەرمووی : (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَلَهُ الْحَمْدُ فِي الْآخِرَةِ ۚ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ)[٧٦] سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە هی ئەوە وە سوپاسی تەواو لە ئاخیرەتدا بۆ ئەوە ، چونکە تۆ لەوانەیە لێرەدا سوپاسی خەلکی بکەیت لەم دونیادا بەس کەس نیە لەدونیاتر إلا ئەبێ سوپاس بۆ الله بکا چونکە هەمووی هی خوایە ئەمەش هی خوایە بس ملهوران نازانن هی خوایە یاخود ئەزانن و عینادی ئەکەن (وَلَهُ الْحَمْدُ فِي الْآخِرَةِ ۚ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ) الله تعالى کار بەجێی یە الله تعالى شارەزایە بەهەموو شتێك وە لێ بترسن و بەقسەی بکەن شوێنی بکەون و مەترسن ئەوە رێبازی راستە و گومانتان تێدا نەبێ ئەوانیتر پوچەلن گومنتان نەبێ لەپوچەلیاندا .

٥– سورەتی فاطر : (الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ) سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە دروست کاری ئاسمانەکان و زەوییە (فَاطِرِ)یانی دروست کار(جَاعِلِ الْمَلائِكَةِ رُسُلا أُولِي أَجْنِحَةٍ مَّثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ) ئەو خوایە کە بۆ مەلائیکە هەیە دوو بالی دروست کردوە هەیە سێ و هەشە چوار (يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاء) لەوەش زیاتر ، جوبرائیل ٦٠٠ باڵی هەیە ئەگەر ئەمریکا و ئەوروپا گەورەترین تەیارە و بالداریان هەیە الله تعالى لەو باڵدارانە گەورەتری هەیە باش بزانن (أُولِي أَجْنِحَةٍ) ئێستا بەس جوبرائیل باڵێك بدا بەئەرزدا چی لێ دەکا ؟!!؟ بە ئیعتقاد و ئیمانی ئێمە پێمان بلێن ؟! وەکو تۆپ بەئاسماندا ئەیسورێنتەوە هەمووتان لەناو ئەچین !! بۆیە با ئەمریکا بە ئەصلیحەکانی خۆی نەنازی(أَجْنِحَ)ی الله تعالى گەورەترێکە یانی ئەوەی کە دروستی کردوە (أُولِي أَجْنِحَةٍ مَّثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاء) لەوەش زیاتر دروست دەکا وەکو وتمان جوبرائیل ٦٠٠ باڵی هەبوو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووی : هەر باڵێکی ئاسمانی داگیر ئەکرد یەك

---

[٧٦] :سورة سبإ اية : ١

باڵێ !! (إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)[٧٧] پێت ئەلێ : ئەلێ الله تعالی توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە بەسات و لەحەزە ئەتوانی تۆ سەرخا وە تۆ راست بکە لەگەل الله تعالی، الله تعالی سەرت ئەخا ، وە نیفاق و درۆ بکا کافر بەسەرتا سەر ئەخا با پێت بلێم ، الله تعالی وەعدی داوە هەرکەسێك لە موسلمانان ئیسلامەکەی بدۆرێنی ئەلێ من کافرەکەت بەسەردا زاڵ ئەکەم ئەوە ئێستاش ئاوایە ئەوە رێك ئەبینینەوە ! .،

ئەمە ئەو پێنج سورەتە بوون کە الله تعالی فێرمان دەکا کەوا سوپاسی بکەین هەر هەمووشی بە چی دەستی پێکرد ؟ بە گەورە راگرتن و تەعظیم کرندی الله تعالی و بەتەقدیسی الله تعالی بەوەی ئیعترافی پێ بکەین بلێن تۆ خاوەنی عەزیمەت و کبریاتی ئەی خوایە ئەوانەی سەر ئەرز هەر هەموویان بێ دەسەلاتن بەس ئەوە ئیمانی ئێمەیە خۆشەویستانم ؟! ئەوەنەی ئێمە لە دووژمنانی دین ئەترسین ئەوەندە لە الله تعالی بترسیباینایە الله تعالی رزگاری ئەکردین حەق بلێ مەترسە لەحەق حەق بلێ و بلێ الله راستە و باقیتری راست نیە بۆیە وەرن بابین بە بەندە و عەبدی الله تعالی وە لەنێوانی خۆشماندا یەك دەست بین الله تعالی دەفەرموی : (كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً)[٧٨] خەلکی هەموی یەك ئومەت بوون دواتر شیرك و ظەلالەتی دروست کرد الله تعالی پێغەمبەری نارد بۆ ئەوەی راستیان بکاتەوە (علیه الصلاة والسلام) الله تعالی دوو و سێ و چواری پێی خۆش نیە الله تعالی یەکی پێی خۆشە هەروەکو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : (إنَّ الله وتْر یحب الوتر) [٧٩] ، دوو سەر لەجێگەیەکدا بێ ئەو شوێنە ئیسراحەت ناکا هەمووتان ئەزانن ، کوردەواری دەلێ : دووسەر لە قاپلەمەنیەکدا جێگەی نابێتەوە .

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووی : (إذا بویع الخلیفتین فاقتلوا الآخر منهما.)[٨٠] کەواتە ئەبێ بەك رێباز بگرین یەك ، دوان وسێ یان نابێ هەمووی ئاغا بێ چۆن ئەبێ !!؟ ئاخر نابێ هەموی ئاغا بێ هەمووی ئاغا بێ تێك ئەچێ .

---

[٧٧]: سورة فاطر اية : ١
[٧٨]: سورة البقرة اية : ٢١٣
[٧٩]: رواه الإمام أحمد وأبو داود والترمذي والنسائي وابن ماجه ، وصححه الألباني والأرنؤوط .
[٨٠]: شرح النووي علي مسلم جزء ١٢ ص٥٥٠ لحديث أبي سعيد الخدي (رضي الله عنه)

دێنەوە سەر سورەتەکە لەدوای ئەم سەرەتاییەدا ئەگەر سەرنجی بدەن سێ چیرۆك و سێ نمونە باس دەکا سورەتەکە بەگشتی ، چیرۆکی یەکەم ئەصحاب و الکهف چیرۆکی دووەم موسا لەگەل خضر چیرۆکی سێ یەم چیرۆکی ذی القرنین ، بەکورتی باسی دەکەین :

ئەصحاب الکهف : چیرۆکەکەی بۆچی باس دەکا الله تعالی وەکو وتمان : ئەم چەند گەنجە حاکمی ئەو زەمانە بەوانی وت : ئەبێ شەریك بۆ الله تعالی بریار بدەن .، ئەوانیش وتیان : پاکی و بێگەردی بۆ الله بێ شەریکە و شەریك قەرار نادەین ، ئەوانیش وتیان : ئەتان کوژین ، ئەوانیش وتیان : با بیر لەخۆمان بکەینەوە و شەوهات و رۆیشتن و ولاتانیان بەجێهێشت روویان کەوتە ئەشکەوتەکە و الله تعالی ئەوانی پاراست ، ئەی ئەو خەلکەی تر بەچی رۆیشت ؟! بەشیرك و گومرایی رۆیشت ! ئەی ئەمان ؟ رزگاریان بوو ، گەنج بوون یاخود نا ؟! دەلیلی تێدایە بەردەوام گەنج سەمع و طاعەی زیاترێکە لەگەل رێزم لەتەمەنەکان ، لەزەمەنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەیر بکە پیرەمێردانی زەمانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەد بەخت بوون لە ئەبو جهل و ئەبو لەهەب و ئومەیەی و فلان و فلان گەنجەکانیش وەکو ئەبو بکر و عومەر و عەلی و عوسمان و هەموویان تەمەنیان لەخوار تەمەنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بووە ئەو کاتە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەمەنی چل سالێ بووە ئەوانیتر تەمەنیان خوارتر بووە لەپێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم) ، ئەبو بکر و عومەر و عەلی هەر سێکیان لە ٦٣ سالیدا وەفاتیان کرد هەمووشتان ئەزانن لەدوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەفاتیان کردوە عوسمانی لێ دەرچێ لەهەشتاکانی عومری وەفاتی کردوە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لە گشتیان بێ ) ، ئەبو بەکر دوو سال و شتێك لەدوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خەلافەتی کرد ئینجا وەفاتی کرد کەواتە چەن سالێ بچوکتر بووە لەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) .؟ دوو سالێ شتێك دوو سالێ دوای سالی فیل لەدوایك بووە ، عومەر ١٠ سالێ دوای ئەبو بکر خەلافەتی کرد ئەویش ١٢ و شتێك لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم )بچوکترە .

یانی ئەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەچل سالی بویتە پێغەمبەر عومەر ٢٨سالێك بووە ئەند گەنج بووە .

یانی نەیەتە خەیالت لەوکاتەدا کە تۆ باسی دەکەی هەمووی پیرەمێرد و هەموی ریش سپی بووبن ئەوها نەبوە بەلکو هەمووی گەنج و کر و کاڵ بوونە لەدەوری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئێستاش ئەبینی پیرەمێردەکانمان سەرکەشترێکن لەگەل رێزمدا لەوەی بە قسەی الله تعالی بکا لە گەنجەکان ، بەلکو گەنجەکان دەلێن : سمعنا وأطعنا ، کەچی پیرەمێرد دەلێ : چۆن وا بکەین ! چۆن و ا بکەین ! ئی عیلمت پیێ یە ؟! ئەگەر عیلم و دەلیلت پێی یە ئەتخەمە سەر چاوم ئەگەر عیلم و دەلیلیشت پیێ نیە بەچۆنەکەی تۆ نابێ بەلکو بەدەلیل و عیلم دەبێ .

لەبەر ئەوە رجا ئەکەم با پیرەمێردەکانمان وەکو خۆیان وەکو ئەوانەی کۆن لێ نەکەن کە لەزەمانی پێغەمبەر بوون (صلی الله علیه وسلم).

پاشان ئەم سێ گەنجە یاخود ئەو ژمارەی کە باسمان کرد لەگەل ئەو دینەی راستەی الله تعالی ئەو کاتەدا رۆیشتن الله تعالی سەربەرزی کردن وە لەشوێنی خۆیان بران و چون بۆ بەهەشت ان شاء الله .

کارەکەیان هەر ئەوەندە بوو هیجرەتێکیان کرد لە پێناوی الله تعالی و ولاتیان بەجێهێشت ، الله تعالی چەندین رێزی لێنان بخەوە ٣٠٩ سالێ دواتریش هەلسەوە و برسی دەبن و یەکێك دەنێرن بۆ خواردن دواتر دێت و دەروا و دێنەوە و لەشوێنی خۆیان ئەمرنەوە ئەمە ژیانی ئەم کۆمەلە گەنجە بوو ، ئیشێکی ئاسان و رێك و پێك چونکە راستیان کرد لەگەل الله تعالی چون بۆ بەهەشت .

چیرۆکی موسا و خضر : ئەم چیرۆکە چیمان نیشان ئەدا هەردووکیان پێغەمبەرن زۆر کەس هەیە لە دەروێشان و صۆفیان دەلێ خضر وەلی بووە وەلی دەرجەی لە نەبی گەورەترە !! ئەمە هەر زۆر بێ عقلییە چۆن وەلی لە نەبی گەورەترە !! (أفضل الخلق الرسول )ئینجا

(الانبيا ثم ألاوليا ) جا لێرەدا شتێكی تێدایە لەگەڵ مەزنیەتی موسایە كە پێغەمبەری خوایە و یەكێكە لە (أولو العزم) (نوح ، إبراهیم ، موسى ، عیسا ، محمد)(علیهم الصلاة والسلام) ئەم پێنجە ، كەچی سەیر دەكەی الله تعالى لەبەر رێزی عیلم بەموسا ئەڵێ شوێن خضر بكەوە كەدەرەجەی لەو لەخوارترە،.

مادەم عیلمە شوێنی كەوە من نابێ بڵێم چۆن بەقسەی ئەم كەسە بكەم من لەو گەورەترم تەمەنەم زیاترە و لەو زیاترم خوێندوە بەڵام وانیە لەوانەیە گەنجێك حەدیثیك بزانی من نەیزانم ئەبێ من زەلیلی حەدیثیكەبم ئەوە فێری ئەوەمان ئەكات .

بەس ئایا ئەمرۆ وایە ؟! ئەمرۆ مامۆستایەك دێت و دەڵێ : ئۆ بابە تۆ لەدایك نەبووی من ئەالف و بێ ئەخوێنم ! ئاخر تۆش ئێستا ئەوە نازانی كە ئەویتر دەیزانی حەق وایە و برۆنەوە سەر عیلم و دەلیل ، لەبەر ئەوە سەیر بكەن موسایەك شوێن خضرێك ئەكەوێی كەوا دەرەجەی لەو نزم ترە چونكە ئەو واتا موسا (أولو العزم) راست ئەویش پێغەمبەرە وەلەو بۆ چونی جیاواز هەیە لەنێوان زانایان بەس رەئی صەحیح ئەوەیە كەوا پێغەمبەر بووە ، موسا تەواضوح دەر دەبرێی ڤی سبیل ی عیلم و شوێن كەوتنی عیلم شوێنی كەوە لەكوێی عەبدەیەكت بینی لەكوێی وە چیرۆكەكەی هات خۆشەویستانم ؟

لەصەحیح هاتووە دەڵێ : بەنی ئیسرائیل كۆبونەوە موسا قسەی بۆ ئەكردن لیًان پرسی ئەی موسا كێ (أعلم الناس في الارض)؟كێ لەهەمووان زاناترە ؟ ئەویش بیری كردەوە و بالفعل لەو زیاتر نیە ، وتی من ! كەچی الله تعالى عیتابی لێ وەرگرت ، فەرمووی : دەبوایە وتبات : الله ، نەك من ، وتبات الله لەهەمووان عالم ترە ، خۆ موسا ئەزانی الله تعالى لەهەمووان عالمترە بەس ئەو كاتە بیری ئەوەی نەبوو بلێ الله ،

پێ فەرموو : مادەم وایە برۆ لەتۆ زاناتر هەیە برۆ لەفلان شوێن کەسێك ئەبینی وا وایە چیرۆکەکەی بەدرێژییە ئێمە باسی ناکەین بەتەواوی ، بۆیە هیچ کاتێك تەکەبورت نەبێ لەعیلم ئەوە موسایە الله تعالی شوێنی کەلەویش خضر دەرجەکەی کەمترە .[81]

چیرۆکی ذی القرنین : ئەو مەلیکەی کەوا جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان کە ئایە بەس مەلیکێك بووە یان پێغەمبەریش بووە هەر کامێکیان بێ لەقورئانەکەدا باسی مەلێکمان بۆ دەکات کە الله تعالی یارمەتی دا و دەستی لەزەوی توند کرد بەلاْم ئەم مەلیکە هەلسا دینی الله تعالی لە شەرق و لەغەرب بلاو کردەوە نەیهێشت کەسێك سەر بەرز بکاتەوە کە دینی الله تعالی بەرێوە نەبات لەلای ئەو قبول کردنی بەرامبەر نیە (رأی والرأی الاخر)بێ و بلێ والله من و تۆ قەینا تۆ چی ئەپەرستی کێشە نیە با برا بین و بۆخۆمان بژین شتی وا نیە ، ئەوەی الله تعالی نەپرستی خراپی بەسەر دێنم ذی القرنین ئاوەها دەلێ لەسورەتی الکهف ئەم مەلیکە عادلە بەتەقوا و بەئیمان گەرا سولطانی خۆی لەسەر زەوی بلاو کردەوە کەس نەبوو عیبادەتی الله تعالی نەکا ئەوەی بیبی بینایە ئەو لێ ئەدا شەرق و غەربی کرد .

ئەمە ئەم سێ چیرۆکە (ئەصحاب الکهف و موسا و خضر و لەگەل ذی القرنین) سێ نموم و میثال مان بۆ باس دەکا سورەتەکە :

یەکەم نمونە : کەسێکی دەولەمەندی موتەکەبیر لەگەل کەسێکی فەقیری خاوەن عقیدەی راستەقینە دوو پیاوەکەی کە الله تعالی بۆمان باس دەکا (وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ)[82] ئەو دوو پیاوە چی بوو ؟ سەیر بکەن یەکێکیان دەولەمەندە یەکێکشیان فەقیرە یەکەمیان ناز دەکا بەدەولەمەندییەکەی دەلێ : رۆژی قیامەت نایە ! وە ئەگەر بێت مادەم لێرە ئەوەی داومەتێ لەوێش ئەمداتێ ئەلێ (وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا)[83] ئەگەر من بگەرێشمەوە بۆلای خوا خۆ ناگەرێمەوە قیامەت نیە بەس ئەگەر هەشبێ خوا لەوە چاکترم

---

[81] : مەبەستی موسا نیە بۆ ئێمەیە والله أعلم .
[82] :سورة الکهف اية : ٣٢
[83] :سورة الکهف اية : ٣٦

ئەداتێ !! چونکە منی خۆش ویستوە لەدونیا ئەوەی داومەتی لەویش ئەمداتێ !! یەك کەسەر پیاوە فەقیرەکە پێ ئەلێ چی ؟ ئەلێ : تۆ کافری چونکە گومانت لەقیامەت هەیە ئەوەی گومانی لە قیامەت هەبێ کافرە.

ئەمەش لێرە دەرسێکی ترە بۆ ئێمە کەسێك کە کوفرێکی کرد و کوفرەکەی ئاشکرا و دیار بوو تۆ لێ راناوەستی و یەکسەر تۆ پێی ئەلێ تۆ کافری ئەمە کافری کردنی بەناحەق نیە بەلکو کافرکردنی بەحەقە ، یانی کەسێك جوێن بە خوا و بەپێغەمبەر بدا (صلی الله علیه وسلم) بلێ قیامەت نیە و بلێ من نوێژ ناکەم و درۆیە تۆ لێ رادەوەستی و دەلێ ئەوە موسلمانە ؟!؟! ئەگەر تۆ بلێ ئەوە موسلمانە ئەوکاتە تۆ کافری چونکە ئەو موسلمان نیە .

ئاگاداربن بەکافرکردنی ناحەق هەیە بەکافرکردنی حەقیش هەیە هەر لەسورەتەکەدا ئەلێ : (أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلًا)[٨٤] تۆ کافر بووی بەو خوایەی کە تۆی لە نوتفەیەك دروست کرد خۆی نیشان دای و وتی تۆ چیت ! تۆ لەئاوی باوکت بووی دواتر تۆی کرد بەم پیاوە لەپێشانە لەخۆل بووی دواتر لە نوتفەیەك و دواتر تۆ کرد بەم پیاوە تەکبور لێ مەدە لەسەر الله تعالی دا ، فەقیرەکە ئەویش بەعقیدەیەکی راست و دروست و بوێرانە و ناترسی بلێ من فەقیرم ئێستا ئەو قسانە بکەم لەوانەیە پارەم نەداتی و لەوانەیە مەعاشەکەم ببرێی !! ئەیبری و نایبری کەیفی خۆتە ئەوە حەقیقەتە .

نمونەی دووەم : الله تعالی نمونەیەکیترمان بۆ باس دەکا هەر لەسورەتی الکهف باسی حەیاتی دونیامان بۆ دەکا (وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ ۗ)[٨٥] ئەلێ ئەم دونیایە ئاگاداربە وەك بارانێك وایە کەبێتە خوارەوە زەویەکت بۆ شین و سەوز و جوان بکا بەو ئاوە هەموو شیناوی تێکەل ببێ با ئەیبا ئەمە دینایەکەتە ئاگاداربە پێی مەنازە .

---

[٨٤] :سورة الکهف ایة : ٣٧

[٨٥] سورة الکهف ایة : ٤٥

نمونەی سیّ یەم : نمونەی خۆ بەگەورەزانین و تەکبور کردنی ئبلیس لەگەل الله تعالی دا ، الله تعالی ئەمری پیّ دەکا کەوا سوجدە ببات بۆئادەم ، ئەویش تەکبور دەکا و ئەلیّ نابەم چونکە منت لە ئاگر دروست کردوە و ئەویشت لە قور دروست کردوە ، الله تعالی پیّت ئەلیّ : سەجدە بەرە تۆ سەجدە نابەی !! الله تعالی پیّت بلیّ خۆت بکوژە ئەبیّ خۆت بکوژی ! تۆ سەجدەیەك نابەی !! لەبەر ئەوە زانایانی صەحابە هەموویان ئەلیّن : نویّژ نەکەر کافرە چونکە پیّی وترا سەجدە بەرە ئەلیّ نابەم سوجدە نابەی وەکو شەیطان کافری ، هیچ گومانت نەبیّ برام لەنویّژ نەکەر کەوا کافرە ، ئەوەتا لیّرەدا شەیطان بەس داوای سەجدەیەکی لیّکرا لەبەهەشت بوو و ئەخوارد و ئەیخواردەوە عەبدی الله بوو و الله تعالی ئەپەرست خۆ جویّنیشی بە الله نەدا لەقورئانیشدا سەیر بکە ئەلیّ : (إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ)[٨٦] لەقورئاندا سەیر بکە ناویّریی لەکاتیّکدا کە کوفر بەتۆ ئەکا را ئەکا ئەلیّ من لەتۆ بەریم (إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ)[٨٧] کەچی الله تعالی پیّی دەلیّ : تۆ کافری و برۆ بۆ جەهەنەم .

داوا ئەکەم لە الله تعالی بەم شیّوەیە سورەتەکانی قورئانمان تیّ بگەیەنی کە سورەتی الکهفت بیستەوە ئەمانەت بیّتە بەر چاو و گویّت وە کە ئەیخویّنیتەوە ئەو سیّ چیرۆکە و ئەو سیّ نمونەیە وە ئەو سەرەتاییەی کە باسمان کرد ئەو فیداکاریانەی ئەم سیّ گەنجە کە وا کردیان لەپیّناوی دینی راستەقینەی الله تعالی بیّتەوە بەر خەیالت هەر ئەمرین ئەچینەوە بۆلای الله تعالی بۆیە با بەسەر بەرزی بمرین خۆشەویستانم با یەك دەست بین و یەك دین بین با قورئان و حەدیسی رسول الله (صلی الله علیه وسلم)سەر مەشقمان بیّ با قسەی صەحابە و تابعین بخەینە سەر سەرمان با قسەی ئەوانەی ئەمرۆ بخەینە ژیّر قاچمان ، پیّغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە فەتحی مەککەی کرد فەرمووی : هەموو ئموری جاهیلم قستە ژیّر قۆنەرەکانم ئیتر تەواو ئەبیّ بەقسەی الله تعالی برۆن ئموری و جاهیلی واز لیّ بیّنن لە باو باپیرانیش یا الله وامان لیّ بکەی بۆ خاتری ناوەجوانەکانت .

[٨٦] :سورة الحشر اية : ١٦
[٨٧] :سورة الحشر اية : ١٦

## ئەو بیدعانەی کە لەبارەی قورئانەوە دەکرێی

یەکێ لەو پەراوانەی یەك لەزانایان نوسیویەتی سەبارەت بە ئەو بیدعانەی کە لەقورئاندا ئەکرێی وە ئەو کەسانەی کە خوێنەری قورئانن لەکۆن و لەنوێدا پەراوێکی داناوە زۆر دوور و درێژ نیە لەکتێبەکەی و پەراوەکەیدا باس لەوە دەکا  دەلێ:

ئەم ریسالەیەم کردوە بەچەند بەشێکەوە ، بەشی یەکەمی باس لەو بیدعانە ئەکا کە لەکۆن و نوێدا زانایان ئاماژەیان پێداوە ئەو کەسەی کەوا قورئان دەخوێنێتەوە ئەو بیدعانە ئەنجام ئەدا کە پێویستە لەسەری لەو بیدعانە خۆی دوور بخاتەوە .

### یەکێك لەو بیدعانە :

خۆ مەشغول کردنێکی زۆر زیاد لەپێویست کە لەرێگەی راست لای ئەدا بەهەندێك لەمەسائیلی تەجویدەوە بۆنمونە : دەرخستنی حەرفەکان خۆی دەبێ ئینسانی موسلمان تەجوید بزانی لەکوێی ئەو حەرفانە دێتەدەرەوە وە وەصفی ئەو حەرفانە چیە وە ئەحکامی ئەو حەرفانە چیە  ئەمە مادەی تەجویدە پێویستە ئینسانی موسلمان بیزانی ، بەلاَم هەیە زیادە رەویی لەمەدا ئەکا ، ئەوەندە زیادە رەویی لەمەدا ئەکا یانی لەحەقی خۆیدا ئەیباتە دەرەوە بۆیە ئەمە یەکێکە لەو بیدعانەی کەزانایان ئیشارەتی پێی ئەدەن.

ئەلێن تۆ تەجوید بخوێنە بەلاَم بەو شێوەی کەوا توشی وەس وەسە بی ئەو حەرفە نەهاتە دەرەوە هەر بیلێتەوە دەمتی بۆ بێنیتی و بەریی و نارەحەتی بکەی چۆن دێی لەدوای ئەوەی کەتۆ خۆت فێر دەکەی ، هەتاوەکو ئەگەر کەسانێك هەن ناتوانن فێربن با بەو شێوازەی کە ئەیخوێنەوە بیخوێنەوە الله تعالى ئەجریان ئەداتەوە ، وە مەبەستیشم ئەوە نیە کەوا هەول نەدا خۆیی  فێر نەکا ، بەلاَم زیادە رەووی لەم قەزیەدا نەکا .

## یەکێکیتر لەو بیدعانە:

ئەوەیە کە بەو شێوازە ناخوێنرێتەوە کەوا دەست بەدەست هاتووە لەپێغەمبەرەوە (صلی الله علیە وسلم) تا صەحابە وە بۆ تابیعین وە بۆ تابعیی تابعین ، بەڵکو بەشێوازێك ئەیخوێنێتەوە ، کەوا لە لوغەی عەرەب دەچێتە دەرەوە بۆ لوغەی حەجەم .

## یەکێکیتر لەو بیدعانە:

باس لەوە دەکا کە بەخوێندنەوە و خوێندنەوەی ئەهلی فسوق و فجور نەیخوێنێتەوە ، کە ئەمرۆ ئەم شتە زۆر باوە خۆشەویستانم ، سەیری ئەهلی فیسق و فجور بکەن لەگۆرانەکانیاندا نەغەماتیەکانیان چۆنە دێت قورئان لەسەر ئەو نەغەمەیە و ئاوازە ئەخوێنێتەوە ئەم گۆرانیە ئەلێتەوە ! ئەولای لایە ئەخوێنێتەوە ، هەر رێك سەیر دەکەی قورئانەکە بەلای لایەکە بەس چی یە؟ ئەو قورئان ئەخوێنێتەوە و ئەویش کەلیماتی خۆی ئەخوێنێتەوە ، نابێ ئێمە تەقلید و لاسایی ئەو کەسانە بکەینەوە ، باسی دەکا لەناو پەراوەکەدا هەتا لاسای و تەقلید کردنەوەی کەسانێك کە ئەگەر بێتوو قورئان باش دەخوێننەوە لەسەر سەوتی ئەو لاسای ئەو بکەیتەوە دروست نیە چ جای لاسای کردنەوەی ئەهلی فیسق و فجور .

## یەکێکیتر لەو بیدعانە:

رۆیشتن لەسەر ئەو مەقاماتانەی کە ئەمرۆ پێی دەڵێن مەقامات لەوانەیە گوێتان لێبوو بێ لەتەلەفزیۆن و رادیۆیەکاندا وە دەزگای بۆ دانراوە ، ئەوە مەقامی سێ گایە و ئەوە مەقامی فلانە ،،، یانی معاذ الله قورئان بهێنرێتە سەر مەقامی گۆرانی ! وەرە کاکە خۆت فێر کە لەسەر ئەومەقامە بیخوێنە ! دائەنیشی خۆی فێر ئەکا تەکلوفێکی زۆر لەخۆی دەکا قورئانی الله تعالی و فەرمایشتەکەی الله تعالی ئەهێنێ لەسەر نەغەمە و مەقاماتی گۆرانی بێژان و

فاسقان و فاجران و ئارەق خۆر و زیناکەران ئەخوێنی وئەکا ، پەنا ئەگرین بە الله تعالى کە لە زۆر دەمێکەوە باوە ئێستاش هەر دێی ! هەتا ئێستا ئەو جۆرە کەسانە خۆیان ناگۆرنەوە بەهیچ کەس وا ئەزانن ئەو پەری عیلمیان بۆ ئێمە هێناوە ! !

قورئان بخوێنەوە وەك سەلیقەی خۆت هەموو کەسێك بیەوێی و نەیەوێی بەشێوەیەك قورئان ئەخوێنێتەوە کەوا دەنگێکی هەیە ئەم دەنگە پێویستە لەموسلمانان هەبێ هەتا دەنگی خۆش زیاتر بێ و هەتا شێوازی جوان زیاتر بێ هەر کەمە ، بەلأم نەك تۆ بچی لاسای و تەقلید بکەیتەوە و قاعیدەی بۆ دابنێی و بلێت وەرە بەم مەقام و بەم مەقامە بخوێنیتەوە ، هاتن قورئانیان هێنایە ریزی گۆرانی و هەلبەست و ئەو بابەتانە .

یاخود سەیر دەکەی قورئان دەخوێنێتەوە و بەشێوازی گۆرانی ئەیهێنی و ئەبیات هەر ئەیهێنی و ئەبیات وە خۆی لەگەل بائەدا قورئان بۆ ئەوە نەکراوە کاکی من ، قورئان بۆ ئەوە کراوە بێتە دەستوری ئەم حەیاتە و تۆ حوکمرانی ئەم سەرزەویی پێی بکەی ملی یەهود و نەصارا و موشریکینی و کافرانی پێی لەناو بەری ، کاتێك کە قورئان وای لێهات تۆ سەری بۆ بادەی و ئەلا و سەربادانی بۆ بکەی ئەوکاتە یەهود و نەصارا ئەلێ برۆ بەخوا هەتا بلێ بێ عەقلە ئەم ئومەتە ، ئەم قورئانە بۆچی هاتوە ئەم خۆی بەچی مەشغول کردوە !برۆن بابۆخۆیان خەریکی دەنگەکەی خۆیان بن ئێمە هەرچی سەروەت و سامانی ئەم دونیایە بیگرین و حوکمرانی دونیا بخەینە ژێر دەستی خۆمان با موسلمان هەر وا بێ عەقل بێ بەگۆرانی بێژ دەرچێ ! بەداخەوە .

### یەکێکیتر لەو بیدعانە:

خۆی قورئان بەچەند لوغەتێك هاتووە لەشەرعی ئێمەدا بەلوغەی قوریش هاتووە وە بەلوغەی فلان هاتوە ، ئەمانە موتەواتیرن ، بەلأم هەندێك قیرائەت هەن شازن ئەم قیرائە شازانە نابێ قورئانی پێی بخوێنرێی دێت خۆی بەمەوە مەشغول دەکا ئەم عیلمە وەردەگرێی لەجیاتی بێت

قورئانەكە لەسەر قیرائاتی موتەواتیر وەربگرێی و حیفظی بكا ، ئەمڕۆ بەراستیەكەی پێتان بلێم خۆ مەشغول كردن بەجۆرەكانی قیرائات ئەگەر چی موتەواتیریش بێ لەنافیلەی علومە واتا عیلمێكی زەرەور نیە بۆتۆ یەك قیرائە لەبەر بكە قیرائەی (حفص عن عاصم) وەرە ئیشی پێی بكە ، دێت خۆی بەوانە مەشغول دەكا بەتایبەتی خۆشەویستانم سەیر بكەن ئەوانەی كەوا باسی قیرائات دەكەن و دەرسی قیرائەت دەلێنەوە ، لەجیاتی بێت بەقسەی قورئانەكە بكا سیمای وەكو پێغەمبەر بێ (صلى الله عليه وسلم)ریشەكەی وەكو پێغەمبەر بێ جلێكی فراوان و جوانی لەبەر بێ ، بەڵكو ئەچێ ریشی بۆ سەرەوە ئەتاشێت و جەگەرەكەی بەدەمیەوە دەبێ وە بۆینباغەكەی لەملیدایە صەلیبەكەی لەملدایە و قورئانم بۆ ئەخوێنێتەوە ، دێت قیرائاتم بۆ ئەخوێنیتەوە و ئەلێ ئەوە ئەوها و ئاوایە ، ئەچێت و قوتابیان كۆدەكاتەوە و پێشم راگەیشتۆتەوە كە لەهەریەكێك مانگێ یەك وەرەقە ئەستێنێ ، هەی مالت بەقور بگیرێی ئەوە قورئان بۆ ئەوە نەكراوە تۆ پارەی پێی وەربگرێی قورئان بۆ ئەوە نەكراوە ئابەم سلوبە بی ، بەڵكو قورئان پێت ئەلێ : (أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ)[88] بەقسەی الله و پێغەمبەر بكە (صلى الله عليه وسلم) كەچی تۆ بەدەم و چاو و سیماكەت موخالەفەی پێغەمبەری خوات كرد (صلى الله عليه وسلم) وە بەجگەرەكەی دەمت موخالفەی پێغەمبەری خوا دەكەی (صلى الله عليه وسلم) تۆ شەرم بكە لەو خوایە ! .

زۆر جار بیستومانە زانایان ئەفەرموون : لەوانەیە كەسێك قورئان بخوێنی قورئانەكە لەعنەتی لێ ئەكا تۆ ئەیخوێنیتەوە لەعنەتت لێ بێ ، خۆت بەدەمی خۆت لەعنەت لەخۆت دەكەی چونكە ئایەتەكە ئەلێ (أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ)[89]تۆ زالمی و تۆ ستەم كاری خۆت لەعنەت لەخۆت ئەكەی ، الله تعالى دەفەرمووێ دەربارەیان : (وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ)[90] ئەی سەرپێی خوا و پێغەمبەری خوا بكا (صلى الله عليه وسلم)الله تعالى ئەیخاتە ئاگری دۆزەخەوە ، تۆخۆت ئەمە ئەخوێنیتەوە كەچی سەرپێچیشی دەكەی ، ئەو كەسەی كەوا ئەبێ لەپێش هەموو كەسێكەوە

[88] : سورة النساء اية : ٥٩
[89] :سورة هود اية : ١٨
[90] سورة النساء اية : ١٤

شەرعی الله تعالی چۆنە ئەبێ ئاوای جێ بەجێ بکا ئەکەسەیە کە قورئان ئەخوێنێ چونکە کەلامی الله ئەیخوێنی وە ئەو کەسەی کەلامی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەخوێنی ، تۆ معقولە شتێك بخوێنیتەوە و بلێ وابکە بلێ نا بەقسەی ناکەم ! بچیت لەجیاتی جێ بەجێ کردن دەنگ خۆشیم بۆ بەکاربێنی ! ! وە گۆرانیم بۆ بەکاربێنی !

سەیری ئایەتەکە بکەن ئەلێ چی : وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ)[91]ئەوەی کەوا سەرپێچی بکا لەخوا و لەپێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم)وە ئەوەی یاخی بێ لەکەلامی خوا و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم)وە ئەوەی بەقسەی خوا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەکا ئەیخەینە ناو ئاگرەوە هەتا هەتایی با بۆخۆی تیدا بسوتێت ، ئینجا تۆ دەبێ وابلێ و بەشێوازی گۆرانی بیلی ! وە بەقسەشی نەکەی بەس بیر لەم کەسە بکەوە کە ئەم ئیشە ئەکا .

## یەکێکیتر لەو بیدعانە:

یەکێکیتر دێت شێوازی قیرائەتەکان فێر ئەبێ ئەچێ تێکەلی ئەکا لەئایەتێکدا یاخود لەنوێژدا ئەچێ چەند قیرائەتێك ئەخوێنێتەوە لەنوێژەکەدا بەیەك قیرائەت بیخوێنەرەوە با ئەم خەلکە سەری لێی نەشێوێت ، بەتایبەتی ئەگەر تۆ لەشوێنێك بێ قیرائەی (حفص) مەوجود بوو ئەوانە بخوێنەرەوە لەوانەیە تۆ بە قیرائەی (ورش)بیخوێنیتەوە خەلك بۆت راست کاتەوە بلێت هەلەت کردوە ،ئەویش نازانی ! بۆ سەر لەخەلك دەشێوێنی ، إلا ئەگەر پێیان بلێت و بۆیان بەیان بکەیت بلێت من ئەوە بەم قیرائەیە ئەخوێنم ئاگاتان لێ بێت .

[91] سورة النساء اية : ١٤

## یەكێكیتر لەو بیدعانە:

یەكێكیتر لەو بیدعانە ئەوەیە كە تۆ ئایەتێك یان سورەتێك تایبەت مەند بكەی بەشتێكەوە كەوا لەشەرع تایبەت مەند نەكرابێ ، ئایەتێك یان سورەتێك لەنوێژیكی فەرزدا وە لەغەیری فەرزیشدا بلێ ئەمە دەخوێنمەوە و تایبەت مەندی بكەی ، بۆ نمونە : سورەتی (الانعام) لەركاتی ئاخیردا لەشەوی حەوتی لەمانگی رەمەزاندا بلێ والله ئەمە موستەحەبە ، ئەمە هاتووە لەكیتابەكاندا وەلەو ئێستا خەلك زۆر لەمشتانە نازانی ، بەلآم لەكتێبەكاندا هاتووە ، یان خوێندنی سورەتی (المدثر)یان (المزمل )یان( انشراح) لەشەوی مەولودی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەعیشادا یاخود لەبەیانیاندا بیخوێنن ، ئەلێن ئەمە پەیوەستە بە لەدایكبونی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)با موناسەبەكەی وابێت ، یان دەلێن ئەو ئایەتانەی كە باسی پێغەمبەر موسای تێدایە (علیه السلام)لەنوێژی بەیانیاندا لەرۆژی عاشورادا بخوێنرێ ،

عاشورا : خۆتان ئەزانن ئەو رۆژەیە كە موسا (علیه السلام) رزگاری بوو لە فیرعەون.

ئەو دێت لەو رۆژەدا ئەو ئایەتانە ئەخوێنێتەوە كەباسی موسای تێدایە (علیه السلام) عەلی ئەساس ئەوە باسی موسا ئەخوێنێن لەو رۆژەدا باسی موسا دەكەین ، حەتمەن بەبێ بەلگە ، یاخود سورەتی الاخلاص لەنوێژی مەغریبدا لەشەوی جومعەدا وە سورەتی الكافرونیش ، یاخود (معوذتین) لەنوێژی مەغریب لەشەوی شەمەدا ،

ئەمانە هەمووی بیدعەن ئەمانە تەخصیص و تایبەت مەند كردنە بەبێ بەلگە .

تایبەت مەند كردنی هەندێك سورەت و ئایەت بە هەندێك شتەوە :

بۆنمونە سورەتی الفاتحە ، ئێستا باوە هەرچیەك دەبێ دەلێن: الفاتحە ، ئەچێ عەقدی زەواج ئەكات گرێبەستی هاوسەرگیریی دەلێن دەی كاكە الفاتحە ! بەبەرەكەتی الفاتحە ، ئەچێتە تەعزیەوە هەر دەلێ الفاتحە ، ئەچێتە هەر شوێنێكەوە الفاتحە ، دەی مامۆستا فاتیحەكەی بدە ، ئەچێتە سەر قەبران وەكو پێغەمبەر بۆیان باس دەكەی (صلی الله علیه وسلم)ئەلێن مامۆستا فاتیحەیەكی هەدییە نەكرد !، ئادەی پێم بلێن ئەو فاتیحەیەت لەكوێی هێنا !؟

تایبەت مەند کردنی سورەتی الفاتحە ئێستا زۆر مەشهورە ، سەیر دەکەی بەبێ بەڵگەیە دواتریش پێت دەڵێ ئەگەر وانەکەی ئەوە رقی لەقورئانە ، دە واللە ی تۆ رقت لەقورئانە نەك ئەو کەسەی شوێن دەلیل و بەڵگە دەکەوێ ، ئەگەر تۆ رقت لە قورئان نەبوایە بەقسەی قورئانت دەکرد تۆ هەموو گیانت موخالەفەی قورئانە خۆت و ژنت و منداڵت و هەموو ژیانت موخالەفەی قورئانە ،بەس لەبەر ئەوەی من فاتیحەیەکەم هەدییە نەکرد و نەم خوێند کە بیدعەیە لەم کات و شوێنەدا من رقم لەقورئانە یان تۆ ؟!

سورەتی یس ، چل جار بەنیەتی قەزای حاجات بخوینە ! لەکوێی هاتووە ئەمە ؟! وە خوێندی ئەم سورەتە لەکاتی شۆردنی مردوودا ، وە لەکاتی دانانی جەنازەکەدا ، هەمووی دەچی قورئانەکە دەکاتەوە و سورەتی یس دەخوێنی ، ئادەی لەکوێت هێنا ئەمە ؟!

ئەصلن قورئان خوێندن لەسەر مردوو ئیمامی شافیعی دەفەرمووێ : پێغەمبەر نەیکردوە (صلی اللە علیە وسلم)وە صەحابە نەیان کردوە وە تابعین نەیان کردوە (لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَا إِلَيْهِ ۚ)[٩٢] ئەگەر ئەوە باشبوایە بۆ ئەم مردوە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) ئەیکرد و صەحابە و تابعین ئەیان کرد ، یانی تۆ لە پێغەمبەر و صەحابە و تابعین شارەزاتریی ؟! لێرە کێشەکە لەوە نیە کە تۆ قورئان بخوێنی یان تۆ بڵێ کاکە جا قورئان چی تێدایە بیخوێنین ؟ ئێمە باسی ئەوە ناکەین بەڵکو قورئان بیلبیلەی چاوی ئێمەیە قورئان رۆحی ئێمەیە وە قورئان مەنهەجی ژیانی ئێمەیە بەڵام هەمووی وەکو خۆی وەربگرە شتێك دامەهێنە لەخۆتەوە ، واخۆت دابنی لە پێغەمبەر و صەحابە و تابعین شارەزاتربی .

یاخود لەشەوی مەولود دا منداڵان کۆدەکەنەوە ئادەی هەریەکە عشرێك لەقورئان بخوێنێ ! لەکوێت هێنا ئەمە ؟!

خوێندنەوە ی قورئان لەسەر گۆڕەکان و پارەوەرگرتن لەسەری ،یان هەتاوەکو لەتەواف مالی اللە تعالی دا بەس قورئان ئەخوێنێی نەهاتوە بەم شێوەیە قورئان دەخوێنی بخوێنە بەڵام

---

[٩٢] :سورة الأحقاف اية ١١

دوعاو زیکریش بکە هەتاوەکو قسە کردنیش جائیزە لەگەل برادەرەکەت و عەمرەکەرەکەت شتێکت پێویست دەبیٚ قسە بکەی ئاساییە.

یاخود قورئان دەخوێنیٚ لەدوای قورئان کە تەواوی کرد ئەلیٚ الفاتحە ! نەهاتوە شتێك کەوا بەلگە بێت بۆ ئەم کارە بەلکو هاتووە کە قورئانت خوێند ئەلیٚ دوعا بکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)نەیوتوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کەوا بلێت (صدق الله العظیم)وە نەیوتوە بلیٚ الفاحە ، ئەمە هەمووی بیدعەیە هیچ پێغەمبەر نەیکردوە (صلی الله علیه وسلم).

یاخود قەولێکیتر هەیە ئەلیٚ (صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا)[٩٣] لەدوای خوێندنی فاتیحەکە یاخود (قول قارءی الفاتحة فی زیأدة فی الشرف نبه صلی الله علیه وسلم)ئاوا دەلێن !

جا ئیمامی إبن حجر العسقلانی دەفەرموویٚ: (هذا الدعاء مخترع من أهل العصر)[٩٤] ئەمە هەمووی داهینراوە لە ئەهلی ئەم زەمەنەوە ، کاتی خۆی نەبوە لەزەمەنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)ئەوشتانە نەبووە ، بەس بەداخەوە قەومەکەی ئێمە ناخوێنێتەوە بەس تەقلید ئەکەن .

## یەکێکیتر لەو بیدعانە:

کاتێك گوێی لە قورئان دەبیٚ لەجیاتی بێدەنگ بیٚ بەتایبەتی ئەمە لەمیصریەکاندا زۆرە ئەلێن (الله الله اللهم صل علی محمد)هاوار ئەکا ، الله تعالی پێی دەفەرموویٚ بیٚ دەنگ بە بەلاٚم ئەو دەلیٚ من بێدەنگ نابم چۆن بیٚ دەنگ دەبم حەیفت نەکرد بیٚ دەنگ بم بەداخەوە .

---

[٩٣] :سورة الأحزاب اية : ٥٦

[٩٤] :

جواهر البحار في فضائل النبي المختار ١-٤ ج٢ ،،ص:١٢٥

یەکێکیتر لەوشتانە هاوار دەکا و دەنگ بەرزدەکاتەوە و خویی دەبورێنێتەوە عەلی ئەساس ئەمە باسی ئەو ئایەتانە دەکا ئەلیٚ ئەگەر موسلمان ئایەتی الله تعالی خوێندەوە لاشەی موچرکی پێدا دێت ، ئەم شتە بەزۆر بەسەر خۆیدا ئەهێنی خۆی ئەخا بەعەرزدا ، زانایان دەفەرموون : دەبا لەسەر دیوارێك دایبنێن لەویدا خۆی ببورێنێتەوە با لەوێی بکەوێتە خوارەوە بزانم ئەیکا ؟! نایکا بەس عەرزەکە نەرمە بۆیە خۆی ئەخا بەعەرزدا .

## یەکێکیتر لەو بیدعانە:

یەکێکیتر لەو بیدعانەی کەهاتوە لەکیتابەکاندا لەرۆژی خەمی قورئاندا بەرۆژوو بە ، شتی وامان نیە لەحەدیسدا وە هیچی لەسەر نەهاتووە ، یاخود دوعای خەتم لەناو نوێژدا کە ئێستا ئەوە زۆر زۆرە بەتایبەتی لە حیجاز دا  گەر بیرتان بیٚ لەهەموو رەمەزانێکدا لەم رەمەزانەش لەوانەیە ئاگاتان لێی بیٚ کە وترەکە ئەکرێی تەبعەن هەموو شەوێك جۆ  ێك یەخوێنرێی دوای جۆ  ە کە لەکۆتایی رەمەزان خەتمێك ئەکەن دوعایەکی دوور و درێژ لەوانە ئەوانەی چوبێتە عەمر لەوێی مابێتەوە ئەلیٚ والله بالّم خەریك بوو شەقی دەبرد ئەلیٚ نازانم چۆن ئیدارەم کرد لەوێی هەیە هەر ناتوانی و دەستەکەی شۆر دەکاتەوە چونکە هیلاك دەبێت !! ئەمە کا هاتوە لە حەدیسی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەصلەن دوعای خەتمی قورئان لە ناو نوێژدا هەر بیدعەیە ،

لەدەرەوەی نوێژدا ئەوە ریسالەیەکە دانەری پەراوەکە شێخ (بکر بن عبدالله أبو زید)کە کتێبەکەی دەخوێنینەوە کیتابێکتری هەیە (مرويات دعا  ختم القرآن)هیچیان صەحیح نیە .کە دوعای خەتمی قورئان لەناو نوێژدا بکەی ، بەڵکو ئەوەی کەهاتووە ئەنەسی کوری مالیك (رەزاو رەحمەتی الله تعالی لیٚ بیٚ)ئەلیٚ : کە خەتمی قورئانی ئەکرد خۆی و منداڵەکانی کۆدەکردەوە و دوعایان ئەکرد .

ئەما لەناو نوێژدا با دوعا کە لەناو نوێژدا بکەم ئەمە ئەصل و فەصلی نیە لەشەریعەتی ئیسلامدا .

## تەقلید کردنەوە :

یەك لەو شتانەی کە زۆر شتێکی ناشرینە ئەو کەسە بەخۆی نازانی تەقلید کردنەوە سەوتی یەکێکیترە ، ئیمامە ئەچێتە پێشەوە تەقلیدی فلان ، فلان ، ئەلێن : بەخوا دەنگی زۆر خۆش بوو لەفلان کەس دەچێ !! کاکە مقلید کەی ئینسانێکی دروستە !؟ ئێستا ئەگەر تۆ ڕۆیشتنی خۆتت هەبێ برۆ لاسای ڕۆیشتنی کەسێکیتر بکەرەوە بزانە لێت تێك دەچێ یاخود نا !! .

شێخ (:بکر بن عبدالله أبو زید) بابەتەکەی زۆر لەسەر ئەمە نوسیوە ، ئەلێ با هەر کەسە و سەوتی خۆی هەبێ ، ئەگەر ئێمە تەقلیدمان کردەوە داهێنان و ئیبداع لەسەوتدا نامێنێ ، تۆ بەس تەقلیدی کەسێك بکەرەوە ئەوە (سعد الغامدی) ئەی ئەو لەکوێی هێنا ؟! ئەو تەقلیدی کێ کرد ؟! ئەو خوا پێی بەخشیوە تۆش وابکە سەوتەکەی خۆت خوا پێت ببەخشێ شتێکی جوانتر ببەشە بۆ ئومەتی ئیسلام ، ئەم قورئانە برازینەرەوە بە سەوتەکەت تەقلیدی کەس مەکەرەوە . جا لێرەدا بەحثەکەی زۆر نوسیوە ئەم بابەتە .

شێخ ئەلێ : ئەگەر تەقلید کردنەوە جائیز بوایە صەحابە تەقلیدی پێغەمبەریان ئەکرد( صلی الله علیه وسلم) چونکە کەس نەبوە وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەوتی خۆش بێ !! ئێوە بیر بکەنەوە بزانن ڕۆژێك لەرۆژان بیرتان کردۆتەوە لەسەوتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) صەحابە ئەلێن : ماشاء الله سەوتێکی پێوە بوو هەر حەزت کردوە گوێی لەقورئانەکەی بگریی ، کەچی صەحابە یەك کەسیان تەقلیدی پێغەمبەریان کردۆتەوە (صلی الله علیه وسلم)خۆیان سەوتی خۆیان هەبوو ، ئەی ئەبو موسای ئەشعەری (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێ ) سەوتی خۆی نەبوو!؟ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژێك گوێ لێگرت خۆی بۆ مەلاس دا و گوێی لە قورئانەکەی دەگرت ، دواتر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی وت : گوێم لێگرتی ، ئەبو موسا فەرمووی : بمزانیایە گوێم لێ ئەگری زیاترم جوانترم ئەکرد (لقد أوتیت مزمارا من مزامیر آل داود)[٩٥] یەك لەو سەوتە خۆشانەی کە ئالی

[٩٥] : رواه البخاري ومسلم.

داواد خۆیان هەیانبوو زەبوریان پێی ئەخوێندەوە تۆش لەوەت دراوەتی ٚ ئەبو موسا ، ئاوا تەشجیعی کرد کەوا هەرکەسە و سەوتی خۆیی هەبیٚ نەك تەقلید کردنەوە .

ئینجا سەیر بکە لەتەقلید کردنەوەدا ، کەسی ئیمام لەپێشەوە ئەی هیێنی و ئەبیات جاری وا غەلەتیش دەکا لەتەقلیدەکەشدا بۆی دەرناچیٚ ، ئاخر چۆن سەیری ئەم خەلکە دەکەی دواتر !؟ تۆ بۆ تەقلید ئەکەیتەوە ، راستە جاری وایە ئینسان سەوتی لەیەکێکیتر ئەچیٚ بەلاًم بەبیٚ تەقلید وە بەبیٚ تەکلوفیش ئەمە هیچی تێدا نیە ، بەس بلێن مجرد سەوتی بەفلان دەچیٚ ئەمە مذمومە ئەمە نا بەس تۆ بێت بەعەمدی من دەمەویت إلا سەوتم وەکو ئەو وابیٚ بەتایبەتی ژنان ئێستا !! ژنان تەقلیدی پیاوان ئەکەن ئەمە دوو خالی حەرامی تێدایە ، یەکەمیان تەقلید وە دوومیشیان تۆ بۆ سەوتت وەکو سەوتی پیاو لیٚ دەکەی تۆ ژنی وەك ژن قورئان بخوێنە .

جا خاوەنی کیتابەکە لەم بابەتە زۆری هێناوە وە لەزانایانەوە قسەی زۆری هێناوە لەکۆتایدا ئامۆژگاری موسلمانان دەکا .

(وأنصحُ كلَّ مسلمٍ قارئٍ لكتاب الله تعالى –وبخاصة أئمة المساجد) من ئامۆژگاری هەموو موسلمانان دەکەم ئەوانەی کیتابی الله تعالى دەخوێنەوە بەتایبەتی ئیمامی مزگەوتەکان (ان يكفُّوا عن المحاكاةِ والتقليد) لاسای ئەوانە مەکەرەوە کە قورئان چۆن دەخوێنن تۆش وەکو ئەو بیخوێنیتەوە (في كلام رب العالمين ، فكلامُ الله أجلُّ)قورئانەکە زۆر لەوە گەورەترێکە تۆ لاسای دەنگی کەسێك بکەیتەوە بەس هیمەتت هەر ئەوەندە بیٚ (وأعظم من أن يَجْلِبَ له القارئُ ما لم يُطلَب منه شرعًا، زائدًا على تحسينِ الصوت حسَبَ وُسْعِه، لا حسَب قدرَتِه على التقليد والمحاكاة ٬ وقد قال الله عن نبيه محمد صلَّى الله عليه وسلَّم: {وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ} ﴿ص من الآية:٨٦﴾،)پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلى الله عليه وسلم) لەقورئانەکەدا الله تعالى دەلیٚ بلیٚ ئەی محمد من لەوانە نیم کەوا تەکەلوف لەخۆم بکەم یانی بەزۆر شتێك بکەم ، بۆنمونە ئەو پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) قورئانی بۆ هاتووە ئەوەندە ئەگەیەنیٚ نەچێت شتێکیتر زیادە بهێنیتە سەر ئەوە تەکەلوف کردن واتا داوا لەخۆ زیاد کردن لەوەی کەوا لەقودرەتی خۆتدایە جوان نیە باشیش نیە هەتاوەکو زانایان ئەم ئایەتە دەهێنەوە بۆ

بابەتی میوانداریش تۆ چیت لەتوانادایە بۆ میوانەکەت ئەوە تەقدیم بکە مەچۆ خۆت توشی قەرز بکەی هەتاوەکو میوانەکەت بەشێوەیەکی جوانتر ببەیت بەرێوە ، بۆیە تەکەلوف شتێکی باش نیە .

بەلاّم گەورەترین شت لەخوێندنی قورئاندا چی یە؟ (ولْيجتهِد العبدُ في حضور القلب)با دلی ئامادەی ئەو قورئانە بێ نەك هەموو مێشکی بزانی چۆن لاسای و تەقلیدی ئەم کەسە دەکاتەوە دوایش هەتا نەتیجەکەی بەوە بێ داوا بکا خەلکەکە پێی بلێن ئەی ئافرین بەراستی شتێکی چاکت کرد دەنگت بەفلان دەچوو ! یانی هەموو ئیشەکەی زەربی سفر کرد بۆ خەلکی کرد و بۆخوای نەکرد توشی ریا بوو ، نەخێر با توشی ریا نەبی قورئان بخوێنەرەوە بۆ الله تعالی وابزانە کەست لەدواوە نیە دەست بکە بە گریان بەسەر قورئانەکەدا ، باشترین قاریئی قورئان ئەوە کەسەیە کەوا لەحەدیسدا وارید بووە کە کاتێك گوێت لێی دەبێ گریان وغەم و پەژارەی لەدلدایە ، ئەمرۆ کا گریانەکان کا فرمێسەکان بەسەر ئایەتەکاندا دەبارێ بەزۆریش دلۆپێك فرمێسك نایەتەخوارەوە وامان لێهاتووە.

هەر لەو بیدعانەی کەوا زانایان باسی دەکەن سەبارەت بەم بابەتە ئەلێن لەتەراویحەکاندا کابرا ناچی بۆ مزگەوتی لای گەرەکەکەی خۆیی تاوەکو زوو بە نوێژەکەی خۆیدا بگا ئەلێ ئەچم بۆ مزگەوتی فلان ئیمامەکە دەنگی خۆشە ! کاتێك ئەزانی نوێژی عیشای لەدەست دەرچووە ، گەورەترین ئیشی ئەو نوێژی عیشایە کەچی لەدەستی دەرچوە ، لەبەر خاتری سەوتێك کە الله تعالی دەزانی بۆ ریایە یاخود بۆ الله یە ! بۆ وا لەخۆت دەکەی خۆشەویستانم وامەکە .

شێخ دەفەرمووێ : (، وإصلاحِ النيَّة)ئەبێ ئیصلاحی نیەتی دلی خۆی بکا بۆ الله تعالی بخوێنێتەوە (فيقرأ القرآن محسِّنًا به صوتَه من غير تكلُّف)بەلێ دەنگی خۆت خۆش بکە بەرێك و پێکی با بێت بەلاّم تەکەلوفی تێدا مەکە زۆر لەخۆت مەکە (ولْيجتنبِ التكلُّف من الأنغام،

والتقعُّرَ في القراءة، والممنوعَ مِن حرمة الأداءِ)[96] با ئەو شتانەی بیدع و حەرامە و وە گۆرانی و مۆسیقایە لەزامانەکەی با بەم شێوەیە لەقورئانەکە نەیهێنێتە دەرەوە .

شێخ دەفەرمووێ : ( ینبغي لمن بسط الله یده أن یجتهد في اختیار الإمام – في الصلاة – الأعلم الأتقى الأروع ) بچۆ لەدوای ئیمامێکەوە نوێژ بکە زانا بێ ئەهلی سونە و عقیدەیەکی خاوێن بێ دڵەکەی بەس الله تعالی تێدا بێ هەرچی بەشەرە فرێی دابێ ، علمانی و صۆفی نەبێ وە دەروێش نەبێ وە ریاباز نەبێ بۆ حیزبێك كار بكا و بۆ خوا ئیش نەكا ، (لا الحزب قد عملنا نحن فی للدیٖن فداء) وەکو دەوترێ ئێمە بۆ حیزب ئیش ناکەی ئێمە بۆ خوا و بۆدین با گیانمان فیدابێ ، چونکە هەمووی بەزایە دەروا هەموو شتەکان بەزایە دەرۆن إلا ئەوە دەمێنێتەوە کە بۆ الله تعالی دەکەیت (ماكان لله بقی)[97].

وەشێخ دەفەرمووێ: (السالم في اعتقاده من مرض الشبهة وفي سلوكهمن مرض الشهوة) شوێن ئیمامێك بكەوێت كە عەقیدەكەی خاوێن بێت لە شوبهات كە بۆخۆشی پاك بێت لەشەهەوات ، ئا سەیری ئەمانە بکەن نەك ، بلێن واللە سەوتی خۆش ئیتر ئەویتر کەیفی خۆیەتی ئەمرۆ زۆر هەن لەو كەسانە موشریك موشریكە هاوار دەكا (یارسول الله صلى الله علیه وسلم) دەخیلەکە ! ئەوە چیە دەنگی خۆشە ئەچی لەدوایەوە نوێژ دەکا کورە ئەوە موشریکە نوێژەکەت دروست نیە واللە ، خوای ئەکرد خۆشترین سەوتی ئەبوو ، ئەو ئەلێ (یارسول الله دخیلەك)یان دەلێ (یا عبدالقادر هاوار)ئەویتر دەلێ یا عەلمانی من سەربەتۆم ، بەخوا نوێژەکەی دروست نیە کابرا با دەنگی چەندهاجار خۆش بێ ، برۆ لەدوای ئیمامێکەوە نوێژ بکە بۆ خوا ئیمام بێ ئیمامەتی خەڵکەکە دەکا دەلێ (وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا)[98] ئیمامی لەخواترس و لەخوا ترسان بێ .

کەواتە لێرەدا ئەبێ بلێن لەجیاتی ئەوەی رابکەی بەدوای ئیمامی دەنگ خۆشدا برۆ بۆلای ئیمامێك ئیمانێکی جوان و رێك و پێکی هەبێ ئەگەر ئیمامی گەرەکەکەت ئیمامی ئەهلی بیدع

---

[96]: بدع القراء ، ابوبكر عبدالله ابو زيد ، ص ٥٥-٥٦

[97]: وروي أنه لما ألف مالك موطئه قيل له: ما الفائدة في تصنيفك؟ فقال: (ما كان لله بقي)، ذكر ذلك السيوطي في تدريب الراوي

[98]: سورة الفرقان اية : ٧٤

و گومرایی و شیرك بوو نوێژ مەكە لەدوایدا برۆ بۆلای یەكێكیتر بەم شێوەیە بچۆ بۆلای یەكێكیتر نەك لەبەر سەوت تەنها .

مەبحەثی سێیەم لەكیتابەكەی شێخ دا باسی (في التحرك عند القراءة) ئەمەش یەكێكیترە لەو بەلایانە خۆ جولاندنەوە لەكاتی خوێندنەوەی قورئاندا ! !

چەند ئەبینن خۆی ئەجولێنتەوە لەكاتی خوێندنی قورئاندا ؟! خۆی ئەجولێنتەوە بۆلای راست و چەپدا لەمندالانەوە دەست پێ بکە هەتا گەورەكان .

شێخ (بكر عبدالله أبو زيد) ئەلێ زانایان زۆر رقیان لەوە بوو كە مندالەكانیان لەكاتی خوێندنی قورئاندا خۆیان بجولاندبا لێیان ئەدان و ئەیانوت وامەكەن ئەوە ئیشی یەهود و جولەكەیە .

بزانین لەكوێی وە هاتووە ؟ شێخ دەلێ (اشتدت كلمة الاندلس في النكير علي : التمايل ، والاهتزاز ، والتحرك ، عند القراءة القران ، وأنها بدعة يهود ، تسربت الى المشارقة المصريين) ئەمە لەیەهودەوە هاتە لای مصرییەكان ئەمە زانایانی ئەندەلوس وادەلێن بۆیە ئەلێ مشارق چونكە میصر لە مەشریقی ئەندەلوسە ، (ولم يكن شيء من ذلك مأثور عن صالح سلف الأمة)لەم ئومەتەدا نە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نە صەحابە وە نەتابعین نەگێراوەتەوە كەوا لەكاتی خوێندنی قورئاندا  خۆیان جولاندبێتەوە .

شیخ دەلێ : (وقد ألف ناصر السنة ابن أبي زيد القيرواني م سنة ٣٨٦هيجري –رحمه الله تعالى – (كتاب من تأخذه  عند قراءة القرآن حركة[٩٩]) ئەلێ كیتابێكی داناوە وەلەو دەلێ (ولا ندري من خبر هذا الكتاب شيئاً .)نازانین ئەم كیتابە مفقودە بەس ناوەكەی مەوجودە ، دەلێ وتویەتی : ئەمە كیتابێكە باس لەوە دەكا كەكەسێك قورئان دەخوێنێتەوە خۆی دەجولێنێتەوە نەهی كردوە لێی .

---

[٩٩] :الوافي للصفدي ٢٥٠\١٧

پاشان شێخ دێت قسەی ئەبو حیانی نەحویی مان بۆدەهێنی کە ناوی محمدی کوری ئەبو یوسفی ئەندەلوسییە لەتەفسیرەکەی کەناوی (البحر المحط) ئەلیّ : ئەم ئایەتەی قورئانی هێناوە کە تەفسیری کردوە (وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّوا أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ)[100] با پێش ئەوە بیخوێنینەوە ئایەتەکە دەفەرموویّ : (وَالَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِالْكِتَابِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُصْلِحِينَ)[101] ئەوانەی دەست دەگرن بە قورئانەوە (يُمَسِّكُونَ) یانی(یتمسکون)یانی دەست دەگرن بەقورئان یانی ئیشی پێی دەکەن یانی بەجدیانە واتا بەس خوێندنەوە نیە (وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ إ)سەیرکەن لەدوای ئەوە راستەوخۆ باسی نوێژ دەکا ، بزانن نوێژ زۆر گەورەیە ئەوانەی دەست بەقورئانەوە دەگرن وە نوێژ دەکەن ، بۆیە صەحابە هەمووی کۆدەنگ بوون کەوا نوێژ نەکەر کافرە ، ئاگاداربن والله نوێژ نەکەر کافرە، چەندەهاجار ئیمامی بە الله هەبیّ هەر کافرەخۆ شەیطانیش ئیمانی بە الله هەبوو بەلاّم کافر بوو (نَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُصْلِحِينَ) الله تعالی دەفەرموویّ : ئێمە ئەجری چاکەکاران ئەوەی چاك ئەکات وشت چاك ئەکات وە دین و ئیمانی خەلکی کە تێك چوە چاکی ئەکات وە بەرە و ئیصلاح و چاکەیان دەبا ئێمە ئەجری ئەوانە بەزایە نادەین ، ئینجا ئایەتەکە دەفەرموویّ : (وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّوا أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ)[102] (نَتَقْنَا)یانی (رفعنا)یانی بەرزمان کردەوە چیایەکەش چیای طورە چیای طورمان بەرز کردەوە بەسەر کیّ دا ؟! بەسەر یەهود دا ، یەهود زۆر وەعد شکێن بوون ئا ئەو یەهودانە لەکۆنەوە تاوەکو ئێستا وەعد شکێنن و بیّ وەعدن زۆر بیّ وەعدن با ئەم گەلە کوردەی ئێمەش بە وەعدی یەهود نەخەلەتیّ بیّ وەعدن وەعدیان لەگەل خوا و لەگەل پێغەمبەر شکاند (صلی الله علیه وسلم)وە لەگەل هەموو خەلکیش شکاندیان وە بەبەردەوامیش دەیشکێنن ، بەس بەداخەوە کەسانێك پێیان هەلدەخەلەتێن ، ئاخر یەهود ئی ئەوەیە تۆ وەعدی لیّ وەربگریی الله تعالی دەفەرموویّ : (وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّوا)ئەوانە پەیمان شکێن بوون الله تعالی کێوی طوری هەلگرت خستیە سەر تۆقی سەریان الله تعالی فەرمووی ئەگەر تەورات بەجوانی بەرێوە نەبەن

---

[100] :سورة الأعراف اية :١٧١
[101] :سورة الأعراف اية : ١٧٠
[102] :سورة الأعراف اية :١٧١

ئەم شاخەتان بەسەردا ئەروخێنم ، وتیان خوایە باشە بەقوربانت بین بەسەر چاو بەرێوەی ئەبین ، کە شاخەکەی هێنایە خوارەوە دیسانەوە پەیمانەکەیان شکاندەوە (وَظَنُّوا أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ)یانی (أیقنوا)واتای (ظَنُّوا)یەقینیان وابوو کەوا ئێستاکە ئەکەوێتە خوارەوە بەسەریاندا ، وەرە تۆ شاخ بەچاوی خۆت ببینی لەسەرتەوە خوای گەورە بەرزی کردەوە بلێ ئەگەر بڕوا بەم تەوراتە نەکەی من ئەیدەم بەسەردا بلێ باشە باشە دواتریش کە الله تعالی کێوەکەی لابرد دیسانەوە وەعدەکە بشکێنیتەوە ! ئەمە ئەوپەڕیی بێ وەعدییە ! فەرمووی : (خُذُوا مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ)[١٠٣] الله تعالی داوای لێکردن ئەم تەوراتە بەو پەری جدیەت بەو پەری رێك و پێکی وەربگرن وە وەلای مەخەن و پشت گوێی مەخەن وە خۆ لەگێلی مەدەن لەو تەوراتە (وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ) [١٠٤] بیر بکەنەوە بزانن چەند وەعدو پەیمانی الله تعالی تێدایە کە لێ وەردەگرن و بەرێوەی ببەین و فەرمانەکانی جێ بەجێ بکەین ، بەلکو ئەگەر وابکەن ئینجا ئەبن بەو کەسەی الله تبارك وتعالی ئەیپارێزی لەئاگری دۆزەخ .

جا ئەم ئایەتەی کە ئێستاماناکەیمان شیکردەوە ، دێنەوە سەر بابەتەکە ئەلێ ئەم ئایەتەی تەفسیری کردوە هێناویەتی : (قال الزمخشري في ((الكشاف)) ٢ / ١٠٢:((لما نشر موسى عليه السلام، الألواح)تەبعەن ئێوە ئەزانن تەورات لەسەر شکلی لەوح هاتۆتەخوارەوە الله تعالی بەدەستی خۆی نوسیویەتی لەئاسمانە هێنایە خوارەوە لەکێوی طور دایی بە دەستی موسا ، موسا وەری گرت ئەلواحەکان ، ئەلواح بریتیە لە پارچە تەختە کە تەوراتی لەسەر نوسرابوویەوە ، فەرمانی الله تعالی لەسەر نوسرابوویەوە و فەرموودەی الله بوو ، ئەلێ کە بلاوی کردەوە (وفيها كتاب الله تعالى، لم يبق شجر، ولا جبل، ولا حجر إلا اهتز) ئەلی هیچ دارێك و بەردێك و شاخێك نەما إلا کەوتە جولە جول (فلذلك لا ترى يهودياً يقرأ التوراة إلا اهتز وأنغض لها رأسه)ئەلێ هیچ یەهودیەك نابینی کە تەورات ئەخوێنی إلا ئەبێ بجولێتەوە کاتێك ئەیخوێنێتەوە ئەگەر سەیری دیمەنەکانیان بکەن ئەبینن کە یەهود تەورات ئەخوێنێتەوە چۆن خۆیان ئەجولێنن ، یاخود لەبەر دەمی جیدارەی کە پێ دەلێن (جدار البكا ) سەیر بکەن کە

---

[١٠٣] : سورة الأعراف اية :١٧١

[١٠٤] : سورة الأعراف اية :١٧١

نوسینەکە ئەخەنەکونەکەوە خۆیان ئەجولێنەوە سەر ئەجولێنن بە پەلە پەل ، ئەوە ئیشی ئەوانە .

شێخ دەفەرموویێ : (وقد سرت هذه النزعة إلى أولاد المسلمين)ئەمش هات بۆ مندالی موسلمانان کە قورئان دەخوێنەوە وا ئەکەن خۆیان بەوان ئەچوێنن !! (فيما رأيت بديار مصر) ئەلێ لە میصر سەیرم کرد مندالان لەناو حوجرەکانیاندا سەریان ئەجولاند (تراهم في المكتب إذا قرؤوا القرآن يهتزون ويحركون رؤوسهم)لەحوجرە کاتێك کە ئەتبینی قورئانیان ئەخوێند و سەریان ئەجولاند و خۆیان دەجولاندەوە (وأما في بلادنا)بەلاًم لەولاتی ئێمە چونکە ئەو ئەندەلوسی بوو (بالأندلس والغرب فلو تحرك صغير عند قراءة القرآن) ئەگەر مندالێك بجولاياتەوە لەکاتی خوێندنی قورئان (أدبه مؤدب المكتب)مامۆستا یاخود مەلای حوجرەکە تەئدیبی ئەدا ئەیوت نەکەی جارێکتر وابکەی (وقال له: لا تتحرك) ئەیوت مەجولێرەوە (فتشبه اليهود في الدراسة)ئەوکاتە تۆ وەکو یەهودیت لێ دێت ، تۆ خۆت ئەچوێنی بەوان .

شێخ (بکر عبدالله ئەبو زید) ئەلێ (وقال الراعي الأندلسي م سنة ٨٥٣هـ تعالى في ((انتصار الفقير السالك)) ص / ٢٥٠:)لەم کیتابەدا باسی دەکا دەفەرموویێ : (كذلك وافق أهل مصر اليهود)ئەلێ ئەهلی میصر خۆیان بەیەهودییەکان چواند ، (في الاهتزاز عند الدرس والاشتغال، وهو من أفعال يهود)نەك هەر لەقورئانیشدا بەڵکو لەدەرسیشدا ، لەکتێبیشدا کە کتێب ئەخوێنەوە خۆیان دەجولێنەوە ،ئەمش یەکێکیتر بوو لەباسی کتێبەکە.

خوێندنی قورئان لەنوێژی جومەعەدا :

یەك لەو شتانەی کە باسی دەکا  ئەلێ : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەنوێژی جومعەدا بەسێ شێوە قورئانی داناوە بۆ ئیمامەکە لەدوای (الفاتحة) بەم سورەتانە بخوێنیتەوە کە بریتیە لە هەردوو سورەتی (الجمعة ، المنافقون)واتا لە رکاتی یەکەم (الجمعة)دەخوێنێتەوە وە لەکاتی دووەم سورەتی (المنافقون).

ئێستا ئەگەر ئەوە بخوێنرێتەوە خەلك چی دەلێ ؟! ئەوە ئێمە جاری وایە سورەتی (الجمعة) ئەکەین بە دوو بەشەوە ئەلێن زۆرە ! لەرکاتی یەکەم بیخونیتەوە پاشان لەرکاتی دووەم سورەتی (ألمنافقون ) هەمووی بەکاملی بخوێنیتەوە .

یاخود سورەتی (الجمعة، الغاشیة) یاخود سورەتی (الاعلی ، الغاشیة ) ئەمە هاتووە لە سونەت کە ئیمامەکە لەجومەعەدا بیخوێنێتەوە ، کەم هەیە لەمامۆستایان ئەمە بەرێوە ببەن ، ئەچن ئەمەیان گۆریوە ئەی پێغەمبەر تۆ نازانی (صلی الله علیه وسلم) معاذ الله ، ئێمە وتارەکەمان لەسەر چی بوو ئەو ئایەتە دەخوێنین!! دیارە تۆ نەتزانیوە ! ئەها بزانن چۆن استدراك بەسەر پێغەمبەرەوە دەکەن (صلی الله علیه وسلم)چۆن خۆیان لە پێغەمبەر بە شارەزاتر ئەزانن (صلی الله علیه وسلم) زۆر بەی وتاربێژەکان وان ئێستا ! ، بابەتەکەی کە باسی دەکا قورئانەکەی کە لەنوێژەکە دەیخوێنێت دێت ئەم ئایەتانە دەخوێنی کە لەوێدا باسی کردوە ، شێخ دەفەرمووێ : ئەوە بیدعەیەکە لەبیدعەکان چونکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وای نەکردوە .

صەوت گۆرین : لەکاتی وتاردان وتار ئەدا ، بەدەنگی ئاسای ئەلێ موسلمانان با وابین و ئاوا بکەین و ئاوا نەکەین ئینجا ئەلێ ئەها الله تعالی وا دەفەرمووێ !! قورئانەکە دەنگەوە ئەخوێنی ، شێخ ئەلێ ئەمە بیدعەیە و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وای نەکردوە هەروەکو چۆن خۆی وتارەکەی داوە ئایەتەکەشی وا خوێندۆتەوە ، ئەبنین لەسەر مینبەرەکان یاخود بانگخوازەکان یاخود کەسێك کەوا نەصیحەتکەرە لەشوێنك بۆنمونە کە دانیشتوین لەکاتی قسەکردنەکەدا ئایەتەکان بەدەنگ ئەخوێنیتەوە نەك بەئاسایی وەکو وتارەکە .

ئەمەش جۆرێکە لەجۆرەکانی وتاربێژ و بانگخوازەکان بۆیە کاتێك وتار دەدا قورئان دەخوێنیتەوە با بە دەنگی ئاسایی بخوێنیتەوە  نەك بەدەنگ و بەتەغەنی وەکو چۆن لە نوێژدا ئەیخوێنن .

## کۆتایی :

بەمە کۆتایی دەهێنین بە کیتابی ئەم جارەمان داوای لێبوردن لە الله تعالی دەکەم لەهەلە و کەم و کوریەکانمان ، قورئاننتان گرت بەدەستانەوە خۆشەویستانم مەرۆ لەو سەر بۆ ئەو سەر بەس بیخوێنیتەوە کاتێ پێت ئەلێن ئەوە چیت وت بلێ والله نازانم برۆ بزانە یەك ئایەت مانای چیە خۆشەویستانم تۆ هەموو رۆژێك بەلێن ئەدەی ئەلێ : (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَ إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ)[١٠٥] بەس ئەو کەلیمەیە مامۆستا هەبوە لەسەر ئەم کەلیمەیە (إِيَّاكَ نَعْبُدُ)ئەوەندە گریاوە نوێژەکەی پێی نەکراوە وتویەتی من چیبکەم والله ی من راست ناکەم من خوا ئەپەرستم من وەعدم داوە بە الله تعالی کەوا بەس تۆ ئەپەرستم هەر تۆ ئەپەرستم هەر بەقسەی تۆ ئەکەم بەقسەی کەسیتر ناکەم کە بیری لەخۆی کردۆتەوە والله ی خوایە درۆزن دەرچووم بەراستی بۆیە گریاوە بۆیە ئەگری لەسەر ئەم ئایەتە ناروا !! خەلکیتر هەیە ئەلێ بۆ ناروا !! دیارەنازانی بیخوێنێتەوە ، با ئەو ئەزانی بیخوێنێتەوە بەس ناتوانی تەواوی بکا لەشەرمان لەبەردەمی الله تعالی دا ، الله تعالی یارمەتیمان بدا .

(وصلى الله وسلم على نبينا محمد ، وعلى آله وصحبه وسلم)

دامـــەزراوەی مــــەتـــیـــن
بۆ کاری راگەیاندن و بڵاوکردنەوە

[١٠٥] :سورة الفاتحة اية : ٥